# ڤالأنتاین

## لە نێوان ڕاستیی و چەواشەدا !

سالار عمر

# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: ڤالاتاین لەنێوان ڕاستی و چەواشەدا

نووسینی: سالار عومەر

پێشەکی: د. احسان برهان الدين

پێداچوونەوە: مامۆستا ڕەنج شێخانی

پێداچوونەوەی ئینگلیزی: سیروان محمد

نەخشەسازیی ناوەوە: عبدالله خاکی

نەخشەسازیی بەرگ: ڕێدار عومەر

نۆرەو ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٣ کۆچی - ٢٠٢٢ زایینی

لەبەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە «١٠٦٧»ی ساڵی «٢٠٢١»ی پێ دراوە.

مافی چاپ کردنی پارێزراوە بۆ نوسەر

بۆ هەر ڕەخنەو پێشنیارێک پەیوەندی بکەن بەنووسەر  @salar__omer

 Salar Omer

## پێشکەشە

*بە دایک و باوکی هەمیشە ماندووم، پێیان دەڵێم هەموو کاتێ خۆشم دەوێن .

- بە خێزانی خۆشەویستم کە هەر لەسەرەتای هاوسەرگیرییەوە ئاوێتەی ڕۆحم بووەو بۆ چرکەیەکیش لێمدانەبڕاوە.
- بەهەموو ئەو کەسانەی کە لەواتای عاشق بوون و خۆشەویستی تێدەگەن و خۆشەویستی لەڕۆژێکدا بچووک ناکەنەوە.
- بەهەموو ئەو کەسانەی یارمەتیدەرو هاوکارم بوونە بۆ کاری خێر بەتایبەت.

# پێشەکی د. احسان برهان الدین

الحمد لله رب العالمین والصلاة والسلام علی أشرف الأنبیاء والمرسلین سیدنا محمد وعلی آلە وصحبە أجمعین إلی یوم الدین...

لەئیسلامدا گرنگی زۆر بەڕاست و درووستی ڕێبازو مەنهەج دراوەو عەقیدەو بیروباوەڕ بریتییە لەو بنەمایەی کە دەبێت لەهەموو بوارێکی ژیانی موسوڵماندا ڕەنگدانەوەی هەبێت، موسوڵمان لەکاروانی ژیانی دونیاو لەڕێکردنیدا بەرەو ڕۆژی دوایی، پێویستە لەهەموو هەنگاوێکیدا، لەهەموو کاروکردارێکیدا، لەهەموو خۆشی و ناخۆشی و خۆشویستن و ڕقلێبوون و شوێنکەوتن و کاریگەربوونێکیدا، پێویستە لەهەموو ئەوانەدا ڕەچاوی حوکم و ئاڕاستەو فەرمانی قورئان و سوننەت بکات و ئەو دوو سەرچاوەیە بکات بەپێوەرو چاودێر بۆ خۆی و بەهەموو حوکمێکیان کار بکات و لەدڵیشەوە پێیان ڕازی بێت، بۆ ئەوەی لێشاوی جاهیلییەتی هاوچەرخ ڕاینەماڵێت و لەڕێبازەکەی دوور نەکەوێتەوە بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت، الله

تعالی فەرمویەتی: (فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا)[1] .

ئەمڕۆ جیهانی ڕۆژئاوا لەهەموو بوارەکانی سەربازی و سیاسی و ئابووری و تەکنەلۆجی و - دواجار فیکریش - هەژموونی خۆی بەسەر جیهانی ئیسلامیدا سەپاندووەو مەخابن موسوڵمان وەکو تاک و وەکو کۆمەڵگا، بەقۆناغێکی لاوازیی مەنهەجی و بۆشایی فیکریدا تیدەپەڕێن و کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ڕۆژئاوا، و ڕاگەیاندنەکانی ئەوان ئاراستەی هزرو دیدو تێڕوانینی زۆربەی موسوڵمانان دەکەن و بەداخەوە توانیویانە لەڕێگەی شوبهەوو گومان لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە لەڕێگەی شەهوە و حەز و ئارەزووەکانەوە لەخشتەیان ببەن، کە من پێم وایە لەدرێژایی مێژووی ئیسلامدا هەرگیز موسوڵمانان لەحاڵەتی لاوازی لەو شێوەیە لەکاریگەربوون بەناحەزانی ئیسلام و لەدەستدانی ئینتیماو پێناسی ئیسلامیدا تێپەڕنەبوونەو دۆخی لەو

---

[1] - النساء/٦٥.

جۆرەی ئێستا لەهیچ سەردەم و قۆناغێکی تری مێژوودا تۆمار نەکراوە، لەڕاستیدا یەکێک لەڕێبازو حوکمەکانی پەروەردگار لەم گەردوونەدا ئەوەیە ململانێ لەنێوان حەق و ناحەقدا هەمیشە بەردەوام دەبێت، ئێمەش وەکو موسوڵمان فەرمانمان پێکراوە پشتگیری و خۆشەویستیمان بۆ موسوڵمانان بێت و لەبێباوەڕان و کردەوە خراپەکانیان بەری بین نەک خۆشمان بوین و شوێنپێیان هەڵگرین! الله تعالی فەرموویەتی: (وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا)[١].

یەکێکیش لەو بۆنەو جەژنە داهێنراوانەی کە لەڕێگەی گاورو جولەکەوە بۆمان هاتووەو هیچ بنەمایەکی لەئیسلامدا نییە جەژن و بۆنەی ڤاڵانتاینە کە بەجەژنی خۆشەویستی دەناسرێت و لەڕاستیشدا ئەو بۆنەیە زیاتر نییە لەڕێگەیەکی دوژمنانی ئیسلام بۆ پەرەپێدان و تەشەنە پێکردنی بێڕەوشتی لەکۆمەڵگادا، لەڕێگەی ڕێخۆشکردن و ئاسانکردنی پەیوەندی ناشەرعی و تێرکردنی

---

[١] - المائدة / ٤٨.



حەزەکــان لەدەرەوەی پرۆســەی پــاک و پــاراوی هاوســەرگیری لەنێوان کچان و کوڕانداو کارکردنە بۆ داڕمانی ئاکــارو ڕەوشــت لەکۆمەڵگــای کوردیــدا، جێگــای داخە کە ســاڵانێکە بەهــۆی دوورکەوتنەوەی موسوڵمانان و بەتایبەتی گەنجان لەدینەکەیان و لاوازییــان لەلایەنــی زانســت و بیروبــاوەڕدا ژمــارەیەکی زۆر بەشداری ئەو بـۆنەیە دەکەن و ڕاسـتی هەڕەشـەو وریـاکردنەوەی پێغەمبەرمــان ﷺ لەشــوێنکەوتنی بێبــاوەڕان هــاتووەتە دی کە فەرموویەتی: (لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ مَن قَبْلَكُمْ شِبْرًا بشِبْرٍ، وَذِرَاعًـا بـذِرَاعٍ، حتَّى لو سَلَكُوا جُحْرَ ضَبٍّ لَسَلَكْتُمُوهُ، قُلْنَا: يا رَسُولَ اللَّهِ، اليَهُودَ وَالنَّصَارَى؟ قالَ: فَمَنْ؟)[1].

ئەم کتێـبەش هەوڵێکـی بـاش و بەسـوودە لەلایەن بـرای بەڕێـزم مامۆســتا ســالار، کە پەردەی لەســەر ڕاســتی ئەو مەســەلە هەڵماڵیــوەو لەڕووی مێژوویــی و ڕەهەنــدەکان و حــوکمی شەرعییەوە بەوردی بەدوای ئەم مەسەلەدا ڕۆیشووە، داواکـارم الله تعـالی نمـوونەی زیـاد بکـات و بەرەکەت بخـاتە کـارەکەی و

---

[1] - رواه البخاري/ ٣٤٥٦.



ئامانجی خۆی لەوریاکردنەوەی موسوڵمانان بپێکێت و هەروەها ببێــتە دەســتپێکی پرۆســەیەکی بەرفــراوان لەلایەن بەرێزیــان و هەمــوو خــاوەن غیــرەت و توانــایەک بەنووســین و بەوتــارو هەر ڕێگەیەکیتری بەردەست، بانگەواز بۆ قورئان و ســونەت بــکەن و بەگوێرەی توانا کار بـۆ لابردنـی غەریبـی ئیسـلام لەکوردسـتاندا بـکەن و ڕووبەڕووی لێشـاوی تەغریـب ببـنەوە، کە ئەمـڕۆ نەک تەنها ناحەزانی ئیسلام کاری بۆ دەکەن بەڵکو کەسانێکیش شـان بەشانی ئەوان بەناو ئیسلامەوە کـار بـۆ هەمـان مەنـهەج دەکەن و بەهەموو چاکەو خراپەیەکی ڕۆژئاوا سەرسامن، و لەدەرەنجـامی ئەو لادانەشدا خەریکە جۆرێک لەعەلمانییەتی دەمامکـدار لەنـاو موســولمانـدا ســەرهەڵدەدات و حەق و نــاحەق بەشــێوەیەکی مەبەستدارو ترسناک بەیەکتر تیکەڵکراون.

والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات.

د. احسان برهان الدين

٢٠٢١/٩/٣

## پێشەکی م. ڕەنج شێخانی

پاش سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ الله سبحانه وتعالى سەڵات و سەلامی خوای گەورە لەسەر پێغەمبەری خۆشەویستمان محمد ﷺ و یارو یاوەرانی بێت تا ڕۆژی دوایی...

لە پاشاندا: بەڕاستی جێی خۆیەتی گەنج و لاوە خۆشەویستەکانمان بەگرنگییەوە ئەم پەرتوکە نایابە بخوێننەوە کە کۆمەڵێک زانیاری گرنگ و بەسودی شەرعی و مێژوویی تێدایە لەسەر ڕۆژی بەناو خۆشەویستی کە ناسراوە بە (ڤالانتاین)، تا بۆیان ڕوون بێتەوە کە بەدوای چی گومڕایی و سەرلێشێواویە کەوتوون، گەر بەجوانی وردبینەوە لەسەرچاوەکانی خۆشیان ئەو کاتە بەتەواوی بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەم بۆنەیە نەمێژوویەکی ڕاستەقینەی هەیە نەلەڕووی شەرعیشەوە درووستە مرۆڤی مسوڵمان برەو بەم جۆرە بۆنە دەستکردو ناڕاستانە بدات.

پاش پێداچونەوەو خوێندنەوەی پەرتوکەکە کە سوپاس بۆ خوا سودێکی باشیشی بەمن گەیاند جێی خۆیەتی کە دەست خۆشی و دوعای خێریش بۆ مامۆستای بەڕێزو دڵسۆز مامۆستا سالاری

خۆشەویســـت بکەیــن کە بەوپەڕی دڵســۆزی و خەمخــۆریەوە هەوڵ و تێکۆشـــانێکی زۆری داوە تـــا کۆمەڵێـــک زانیـــاری نەبیســـتراوو گرنــگ بخــاتە بەر دیــدەی خــوێنەران کە بــۆ منــیش شتێکی نوێ و تازەبوون لەسەر ئەم بۆنە جاهیلییە، داواکــارم لەالله سبحانە وتعالی نمونەی ئەم مامۆستا بەڕێزە لەزیادبوونـدا بێـت و بیکاتە توێشوی قیامەتیان و گەنـج و لاوەکانیشـمان سـودی لـێ ببینن إن شاء الله.

لەگەڵ ڕێزو خۆشەویستی بەندەی موحتاجی دوعای خێر:

ڕەنج شێخانی ٢٠٢١/٨/٢٣





# پێش باس

بەداخەوە لەم سەردەمەی ئێمەدا موسڵمانانی جیهان بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی باوەشیان بۆ هەموو فیکرو ئایدۆلۆژیایەک کردووەتەوەو بوونەتە هەڵگری هەموو جۆرە بەرنامەیەکی دەستکرد، وە باوەشیان بۆ دینی حەق و ڕاستی بەتوندی داخستووە، بەشێکی موسڵمانان کار بۆ هەموو بیرۆکەو بەرنامەیەک دەکەن و بەهێزی دەکەن و لەسەری دەنووسن و دەخوێنن و گفتوگۆی لەسەر دەکەن، بەڵام بۆ ڕاستی و پەرستشەکان ئەندامەکانی لاشەیان لەکارکەوتووە.

وە هەربیرۆکەو هەرباسێک کە دێتە ناو کۆمەڵگەی ئێمە بەبێ لێکۆڵینەوە لەڕاستی ئەو بابەتە بەخێرایی و بەبێ گوێپێدان کە ئاخۆ لەگەڵ ئایین یەکدەگرێتەوە یان نا، ئایا کاریگەری لەسەر بیروباوەڕیان درووستدەکات یان نا، یەکسەر قبوڵی دەکەن و جێبەجێی دەکەن، جا زۆر جار بودجەی زەبەلاحیشیان بۆ تەرخان دەکەن، بەتایبەت لەو بابەتانەی کە گەنجی موسڵمانی

پێ بەلاڕێ دەبەن و بێئاگایان دەکەن لەئایین و گرنگیدان بەڕەوشتە جوانەکان .

یەکێک لەو بابەتانەش کە ماوەیەکی زۆرە هاتووەتە ناو کۆمەڵگەی ئێمەو بەدرووشمی چەواشەکارانە بانگەشەی بۆ دەکەن و خەڵکیان لەدەوری کۆکردۆتەوە ئەویش ڕۆژی بەناو جەژنی خۆشەویستی "ڤالآنتاین"ە.

بێگومان ئەو بابەتەش مەترسیدارە چونکە ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر تێکدانی بیروباوەڕی موسڵمانان درووستدەکات و هەڕەشەی نەمانی تەوحیدو مەترسی لادانی لەڕێگەو ڕێبازە ڕاستەقینەکەی ئیسلامی لێدەکرێ، جگەلە ئەوەش هۆکارە بۆ لادانی ڕەوشت و نەمانی ڕەوشتی کۆمەڵگەو بەپلەی یەکەمیش قوربانییەکان گەنجەکانن .

ئەمڕۆ ئەوەی کە دێتە بەرباس و گفتوگۆی لەسەر دەکرێ لەڕاگەیاندنەکان یان کۆڕو سیمیناری بۆ دەبەستن بێگومان بەشێکی کەمی نەبێت ئەگینا زۆربەی زۆری باسەکان بۆ تێکدان و بەلاڕێدابردنی کۆمەڵگایە لەیەکخواپەرستی (تەوحید) و



بانگەشەکردنە بۆ فرەخواپەرستی، لەپاکی ڕەوشتەوە بۆ پیسی، زانراوە کە هەموو گەل و نەتەوەیەک بەڕەوشتی بەرز دەمێنن و بەرەو پێش دەچن، کاتێک کە ڕەوشت نەما ئیتر وورده وورده لەناودەچن لەهەموو ڕوویەکەوە، وە بەئاسانی دوژمن زاڵ دەبێ بەسەریان و لەناویان دەبات.

وە لەو بەرنامانەشیاندا سەرکەوتنیان بەدەستهێناوەو بەو بانگەشەکردنەو خەڵکێکی زۆریان بەلاڕێدا بردووە، ئەم سەرکەوتنەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار:

یەکەم: ڕاگەیاندنی عەلمانیەت هێزی زۆر زیاترەو بودجەی بەهێزترەو پاڵپشتی زیاترە لەجیهان وەک لەڕاگەیاندنەکانی موسڵمانان.

دووەم: نەخوێندنەوەو تێنەگەیشتن لەواتاو مەبەستی قورئانی پیرۆز بەپلەی یەکەم و دواتر بابەتەکانیتر بەگشتی، بۆیە موسڵمانان زۆر بەئاسانی تێدەکەون بەتایبەت ئەوانەی باوەڕیان لاوازەو بینەری ئەو کەناڵە عەلمانیانەن.



جگەلە ئەوەش بەداخەوە سەیر لەئەوەدایە بەشێکی زۆری بانگخوازەکانمان لەم جۆرە بابەتانەو ئەم بابەتەش تێکەوتوون و بەشداریکردنیان لەم ڕۆژەدا لەلا ئاساییە، هەندێ جار خۆشیان لەئەم ڕۆژەدا بەشداری دەکەن و پیرۆزبایی دەنێرن و بەشانازیەوە باسی دەکەن و پشتگیریی خۆشیانی بۆ دەردەبڕن، بێگومان ئەم جۆرە ڕەفتارانەی بەشێکی بانگخوازانیش کارەکە مەترسیدارتر دەکەن چونکە بەهەزاران خەڵک گوێیان بۆ دەگرن و قسەکانیان بەگرنگ وەردەگرن و جێبەجێ دەکەن، بۆیە موسڵمانان دەبێ وریاتر بن و زیاتر وردببنەوە لەهەرباسێک کە دێتە پێش و بیروباوەڕەکەیان بپارێزن و موسڵمانێتیەکەیان لەبیر نەکەن، ئەوە لەبیر نەکەن کە پەروەردەگار چ نیعمەتێکی لەگەڵ کردوون کە موسڵمانێتیە.

ئێمە لەم پەرتووکەدا بەپشتیوانی پەروەردگار ڕاستی و دروستی "ڤالآنتاین" باس دەکەین تا گەنجەکانمان وریاببنەوەو لەواتاو مەبەستی ڕۆژی بەناو جەژنی "ڤالآنتاین" تێبگەن کە چ مەترسیەکی بۆ سەر بیروباوەڕیان هەیە بۆ ئەوانەی بڕوا بەئەو



ڕۆژە دەکەن و وەکو جەژن سەیری دەکەن و بەشداری تێدا دەکەن، داواکارم لەپەروەردگار لەهەڵەو کەموکوڕییەکانم ببورێ ئەم پەرتووکەش بکاتە هۆکارێک بۆ بەئاگا هێنانەوەی گەنجەکانمان و بیکاتە توێشووش بۆ قیامەتم.

ئامین...

بەندەی موحتاجی لێبووردەی الله:

سالار عومەر

١/٦/٢٠٢١ هەولێر / سەرکارێز





## ڕێڕەوی باس

خۆشەویستی: هەستێکی گەورەو بەهێزە لەناخی مرۆڤدا درووستدەبێت جا بەرامبەر کەسێ بێ یان هەرشتێک، وە ئەو هەستە وەها لەمرۆڤ دەکات کە مەیلی بچێ بۆ خۆشەویستییەکەو دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە، کە کەوتە ژێر کاریگەری ئیتر دەیەوێت هەموو ژیانی لەخزمەت ئەو بێت و لەنزیکی بێت و بیپارێزێت.

یاخود دەتوانین بڵێین خۆشەویستی پاڵنەرێکە کۆنترۆڵی مرۆڤ دەکات لەهەڵسووکەوتی بەرامبەر کەسێک یان شتێک، خۆشەویستی وەک هەرچەمکێکیتری زانستی لەیەک پێناسەدا کورت ناکرێتەوە ئەمەش بەهۆی فرەڕەهەندی و فرەتێڕوانینی بوارە جیاجیاکانەوە، بەڵام بەواتا فراوانەکەی خۆشەویستی واتاگەلێک دەبەخشێ، وە بەپێی پۆلێنکردنی جۆری پەیوەندییەکە جیاوازی بەخۆوە دەبینێ کە دەکرێت جۆری خۆشەویستییەکە خۆشەویستی مرۆڤ بێت بۆ "ئایین و نیشتمان و یان خزمایەتی،



یاخود بۆ هاوڕێ، دایک و باوک و منداڵ و خۆشەویستی هاوسەرو...تاد".

جێگەی داخە لەم چەند ساڵەی دوایی لەنێو لاوانی کوردی موسڵمان نەخۆشییەکی زۆر ترسناک بڵاوبووەتەوە ئەویش نەخۆشی بەشداریکردنە لەجەژنەکانی گاور (نەصرانی) و خاچپەرستان کە هەمووی زیندووکردنەوەیە بۆ داب و نەریتەکانی داوێنپیسی و فەوتان و فەسادی ڕەوشتی.

بەداخەوە گەنجەکانمان دەبینین لەجەژنی ڕەمەزان و قوربان تا نیوەڕۆ دەخەون کەچی لەجەژنی "ڤالانتاین" هەر لەبەرەبەیانەوە بەئاگان و تا نیوەشەو خەریکی نامەو تەلەفۆن و دەربڕینی وشەی سۆزدارین و ئاهەنگ دەگێڕن و پیرۆزبایی لەیەکتر دەکەن .

زیاد لە (١٧) چاخ لەمەوپێش ئەو کاتەی کە بتپەرستی لای ڕۆمانەکان باو بووە ئەو بەناو جەژنەیان گێڕاوە، ئەم بەناو جەژنەش گوزارشت بووە لەچەمکی بتپەرستی ڕۆمانییەکان بۆ خۆشەویستی خودای داتاشراویان، ئەم بۆنە بتپەرستییەش چەندین ئەفسانەو خورافیاتی لەپشتەوەیە، لای ڕۆمانەکان و

دواتریش لای گاورەکان و بەشێکی زۆر لەدانیشتوانی وڵاتانی جیهان هەربەردەوام بووە.

بەشداریکردن و ئاهەنگ گێڕان لەم ڕۆژەدا تەنها وڵاتانی خۆرئاوای نەگرتەوە بەڵکو گەشەی کردو پەلیهاوێشتە ناو وڵاتانی ئیسلامیشەوە، بەداخەوە کچان و کوڕانی مسوڵمانیش گیرۆدەی ئەو داوە بوون و بوونە چاولێکەرو ئێستا هەمووساڵێک بەبێ لەپێش چاوگرتنی واتاو ڕەهەندە ئاینی و مێژووییەکەی هاوکات لەگەڵ گاورەکانی جیهان جەژن دەگێڕن.

ساڵانە لەسەرتاسەری جیهاندا ڕۆژی خۆشەویستی بەشێوازو ڕێگەی جۆربەجۆر یاد دەکرێتەوەو مەراسیمی جیاوازی بۆ ساز دەکرێت، ئەگەرچی بەپێی ناوچەو وڵاتە جیاوازەکاندا، بەتایبەتی لەکۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتی و بەتایبەتتر لەکوردستاندا سەبارەت بەم بابەتە دیدو تێڕوانینی جیاواز لەئارادا دەبێت و بۆچوون و لێکدانەوەی جیاوازیش دەکرێت.

لە١٤ی شووباتی هەموو ساڵێک ڕۆژی خۆشەویستی یان ڕۆژی ڤالانتاین یاخود ڕۆژی عاشقانە، بۆنەیەکە لەسەرتاسەری جیهاندا



عاشقان یان خۆشەویستەکان خۆشەویستی خۆیان بۆ یەکتری دەردەبڕن و یادی ئەو ڕۆژە دەکەنەوەو ئاهەنگی بۆ دەگێڕن، لەم ڕۆژەدا خۆشەویستان لەڕێگەی جۆربەجۆری وەک نامەگۆڕینەوە[1]، ناردنی گوڵی سوور، چوکلێت، کارتی پیرۆزبایی، نامەی دڵداری، ئاڵوگۆڕی وشەو هەست، یان چەند دێڕە هۆنراوەیەکی دڵداری گوزارشت لەخۆشەویستیی خۆیان بۆ یەکتری دەکەن و هەوڵی دەرخستنی هەست و نەستی سۆزدارییان دەدەن، هەروەها دیاری بەیەکتر دەبەخشن، لەم ڕۆژەدا ڕەنگەکانی جل تایبەتن زیاتر بەناو عاشقەکان جلی سوور دەپۆشن بەپلەی یەکەم و بەپلەی دووەمیش سپی و پەمەیی، وە هەروەها ڕۆژی ڤالانتاین یەکێکە لەپشووە جیهانییەکانی ساڵ لای بەناو عاشقان، ساڵانە زیاتر لەملیارێک کارت دەنێردرێت.

---

[1]- لە هەندێک وڵات کردوویانە بەجەژنی هاوڕێیەتی وەک لەوڵاتانی وەکو فینلەنداو دانیمارک، ئەمەش لەبەر ئەوەی خۆشەویستی و عەشق لای ئەوان کۆتایی پێهاتووەو وورد وورد دەیانەوێت هاوڕەگەزبازەکانیش بهێنە ناو ئەو یادەو بەشدارییان پێبکەن. (لەسەر زاری مامۆستا ڕەنج شێخانی کە خۆی لەئەورووپا ژیاوە)...



بزانە چەندین ڕاستی نادیار هەیە لەبارەی ڕەسەنایەتی پشووی خۆشەویستی "ڤالآنتاین" لەڕاستیدا هەندێک لەمێژووەکان جگەلە تێکەڵیەکی سەرلێشێوان لەئەفسانە کۆنەکان هیچیتر نییە، کەواتە دەبێت واتای ڕاستەقینەی ڕۆژی ڤالآنتاین چی بێت؟!.

گەر بگەڕێینەوە بۆ مێژوو زیاد لەڤالآنتاینێک دەبینین، سەرچاوە مێژووییەکان پێمان دەڵێن کە سێ کەسی بەهەمان ناوی سانت ڤالآنتاین لەهەمان ڕۆژدا کوژراون، بۆیە بێسەروبەری و سەرلێشێواویەکی زۆر هەیە لەم باسەدا.

بۆیە ئێمە وەک موسڵمان پێویستە بزانین باسەکان چین دەربارەی ئەم ڕۆژەی ڤالآنتاینەو پێویستە واتا ڕاستەقینەکەو سەرچاوەی ئەو بابەتە بزانین و بزانین کە ئایا لەگەڵ دین و بیروباوەڕی ئیسلام دەگونجێ یان نا، ئایا بەشداریکردن لەم ڕۆژەدا ئاساییە؟

یان دەبێ خۆمانی لێبپارێزین ؟.

سەرەتا لەم کتێبەدا باس لەمێژوو چۆنیەتی سەرهەڵدان و ناسینی ڤالآنتاین دەکەین[1]، دواتریش لەڕوانگەی شەرعەوە تیشکی دەخەینە سەرو باسی دەکەین.

---

[1]- تێبینی: لەم کتێبەدا چەند سەرچاوەیەکم بەکارهێناوەو باسەکانم وەکو خۆی داناوە، چەندین سەرچاوەیتر گەڕام باس و مێژووی ڤالآنتاین لەئەوانە زیاتر نەبوو، وە ئەو باسانەی داماون واتاکانیان لێک نزیکە بەڵام هەندێکیان کەمێ گۆڕانکاری تێدایە، یان هەیانە وەکو یەکتر باسی دەکەن، بەڵام من بۆ ئەوە دامناوە تاوەکو خوێنەر لەهیچ شوێنێکیتر بۆی نەگەڕێت و بۆ دەوڵەمەند کردنی بابەتەکە دامناون وە خوێنەریش لەهەر سەرچاوەیەکیتر بگەڕێ هەر ئەوەندەیەو باسیتری لەسەر نییە .



# ڤالانتاین

ڤالانتاین بۆنەیەکی بتپەرستەکانە، چەندین ئەفسانە و خورافیاتی لەپشتەوەیە کە لای ڕۆمانەکان و میراتگرە گاورەکانیش هەربەردەوام بووە، لەوانە ڕۆمانەکان کە باوەڕیان وا بووە "ڕۆملیۆس"ی دامەزرێنەری شاری "ڕۆما" ڕۆژێک لەڕۆژان گورگێک شیری داوەتێ و ئەمەیش هێزو بیرتیژیی پێبەخشیووە[1]، ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە ڕۆمانەکان بەهۆی ئەو ڕووداوەوە لەناوەڕاستی مانگی شووباتی هەموو ساڵێکدا ئاهەنگیان گێڕاوە، ڕۆژی خۆشەویستی یان جەژنی

---

[1]- ئەو کەسانەی ڕێکلامی ڕۆشنبیری دەکەن و ئیسلام بەکۆنەپەرست و دواکەوتوو دادەنێن و دەڵێن ئیسلام خورافیاتی تێدایە، ئەو کەسانە بەشداری دەکەن لەم بەناو جەژنی ڤالانتاینەو ڕێکلامی بەهێزی بۆ دەکەن و کۆڕی بۆ دەبەستن، ئایا هیچ عەقڵێکی تەندروست و تێگەیشتوو باوەڕ بەوە دەکات کە گورگێک شیر بەمنداڵێک بدات؟ و منداڵەکەش بەهۆی ئەو شیرخواردنەوەیەوە بیری تیژو جەستەی بەهێزبووبێ و ڕۆمای دامەزراندبێ ؟ بێگومان نەخێر،کەواتە ئەو کەسانە تەنها کەسانێکی دژە دینی ئیسلام و عەقڵ نەخۆش و نوقسانن.

خۆشەویستی، جەژنی عاشقان، ئەمانەو کۆمەڵێ ناویتر دەخەنەپاڵ ڤالانتاین، کڵێسای ڕۆژهەڵات لەڕۆژی ٦ ی حوزەیران یادی دەکاتەوەو کڵێسای ڕۆژئاواش لە ١٤ی حوزەیران یادی دەکاتەوە. ڕۆژی ڤالانتاین لە ١٤ی شووبات دەستپێدەکات و لە١٥ی شووبات کۆتایی دێت و ئیتر هیچ ناوێ نامێنێ بەناوی خۆشەویستی دوای ئەو ڕۆژە، ئەمەش بەڕاستی نەفامیە تۆ لەساڵێکدا خۆشەویستی تەسک و بچووک بکەیتەوە لەیەک ڕۆژدا، چونکە ئەم تەسک و بچووک کردنەوەیە تیرۆرکردنی خۆشەویستیە نەک گرنگیدان بەخۆشەویستی، ڤالانتاین بۆنەیەکی ئەفسوناوییەو ڕاستەقینە نییە، بەڵام بەپێی قسەی شوێنکەوتووانی ئەو یادەو بوونی چەند بیروبۆچونێکی جیا جیا کە گوایە باس لەوە کراوە ڤالانتاین لەچییەوە هاتووە جیاوازی هەیە دەربارەی ژیانی ڤالانتاین، ئێمە لێرەدا ئەفسانەکان دەخەینەڕوو لەسەرچاوەکانی خۆیانەوە:



## پێش ڤالَانتاين

ئەم بەناو جەژنە پێش ئەوەی گاورەکان (نەصرانیەکان) کاتی بۆ دابنێن بتپەرستەکان لەو ڕۆژەو لەناوەڕاستی مانگی شووبات ئاهەنگی تايبەت بەخۆيان هەبووەو يادی ئەو جەژن و بۆنەی خۆيانيان کردووەتەوە، ئەم بۆنە بتپەرستيەش چەندين ئەفسانەوخورافياتی لەپشتەوەيە، کە لای ڕۆمانەکان و دواتريش لای گاورەکان (نەصرانيەکان) و بەشێکی زۆر لەدانيشتوانی وڵاتانی جيهان هەربەردەوام بووە. ڕۆژی ڤالَانتاين يەکێکە لەکۆنترين ئاهەنگەکان و پێدەچێت بگەڕێتەوە بۆ فێستيڤاڵێکی ڕۆمانی بەناوی (Luberkalia) لوبيرکاليا کە ماوەی سێ ڕۆژ بەردەوام بووە، مەراسيمەکە لەناوەڕاستی مانگی شووباتدا بەدەستپێکردنی فەرمی بەهار، بەڕێزلێنانێ لەخودای بەپيت بەڕێوەدەچوو[1]، لەچوارچێوەی مەراسيمەکەدا کوڕان کاغەزيان

---

[1] هەندێ جار بۆماوەی ساڵێك ئەو کچ و کوڕە لەگەڵ يەکتر دەمانەوە، گەر حەزيان بکردا هاوسەرگيريان دەکرد گەرنا جيادەبوونەوە و جارێکی تر ئەو ئافرەتە ناوی ڕادەکێشرايەوە و بۆ پياوێکی تر دەردەچوو بەهەمان شێوە دەستيان بە ڕابواردن دەکردەوە،ئەم سوکايەتی کردن بەئافرەتان ئێستا ياد دەکرێتەوە و شانازی بەبەدڕەوشتی و بڵاوکردنەوەی دەکەن. لە ئيسلام ڕێزی تايبەتی بۆ ئافرەت داناوە و بە سوک و سانايی لە



لەسندوقێک ڕادەکێشا کە ناوی کچانی لەسەر بوو، جا ناوی هەرکچێک دەربچووایە بەدرێژایی ڤیستیڤاڵەکە لەگەڵی دەمایەوە، وە هەندێ جار هاوسەرگیری لەگەڵ دەکردو هەندێ جاریش دوور دەکەوتنەوە، لەسەدەکانی دواتردا کڵێساکە ویستی کۆتایی بەمەراسیمەکانی بتپەرستی بهێنێت و ئەم بۆنەیەی کرد بەجەژنی گاورەکان (نەصرانیەکان) کە یادی سانت ڤالآنتاین دەکرایەوە[1].

"ئافرەت کاڵا نییە تا بۆ هەوەس و خۆشی و مەبەستی تایبەت بەکاربێت، بەڵکو ئافرەت شوێنی حەوانەو نیشتیمانە بۆ پیاوو منداڵەکانی، و قوتابخانەیە بۆ کۆمەڵگا"

پێگەی ئافرەتی نەڕوانیوە و ڕێزی زۆری بۆداناون،ئافرەت کەگەیشتە تەمەنی شووکردن پرس و ڕاوێژی پێدەکرێ و دەبێ کوڕەکە ببینێ و بەدڵیشی بێ و نابێ بەزۆر بیدەن بە پیاو،بەڵکو بەدڵی خۆی دەبێ شوو بکا بەو مەرجەی ئیسلام دیاریکردوون .

[1] https://www.bbc.com/arabic

## ڕۆژی ڤاڵانتاین و مێژووی سەرهەڵدانی

مێژووی ئەو ڕۆژە دیار نییە، بەڵام هەموویان دەزانن کە مانگی شووبات مانگی خۆشەویستییە،  ڕۆژی خۆشەویستی وەکو ئێستا دەزانین پێکدێت لەچەند داب و نەریتێکی گاور (نەصرانی) و ڕۆمانی کۆن.

کڵێسای کاسۆلیکی دان بەئەوەدا دەنێن بەلایەنی کەم کەوا سێ قەشە هەبوونە بەناوی (ڤاڵانتاین یان ڤاڵانتینۆس) هەر هەموویان کوژراون.

ئینجا ڤاڵانتاین زۆر قسەو باسی لەسەرە، یەکێک لەئەفسانەکان دەڵێ: کەوا ڤاڵانتاین قەشەیەک بووە خزمەتی کردووە لەسەدەی سێیەم لەڕۆما، لەو کاتەی کە ئیمپڕاتۆر (کلاودیۆس) فەرمانی هاوسەرگیری قەدەغەکردبوو لەگەنجەکان، ئەوانەی کە یەکتریان خۆشدەویست، بەبیانووی ئەوەی ئەو گەنجانە بێنە ڕیزی سوپاوە باشترە لەوەی ژن بهێنن، هەروەها ئەوانەش کە ژنیان هەبوو پێیان



ناخۆش بوو ماڵ و خێزانیان بەجێبهێڵن و بێنە مەیدانی شەڕکردن.

جا ڤالانتاین بەتوندی دژی ئەو بڕیارە وەستاو بەنهێنی هەڵدەستا لەکڵێسا کوڕو کچەکانی لەیەکتری مارە دەکرد، لەو کاتەدا ئیمپڕاتۆر بەئەمە دەزانێت و فەرمانی لەسێدارەدانی بۆ دەردەکات، وە بۆ سووک کردنی سزاکەی ئیمپڕاتۆر پێشنیار بۆ ڤالانتاین دەکات کە واز لەئایینەکەی بهێنێت و خودای ڕۆمانیەکان بپەرستێ.

بەڵام ڤالانتاین ئەو داوایە ڕەتدەکاتەوە، لەئەنجامدا لە١٤ی شووبات ساڵی ٢٦٩ ز یان ٢٧٠ ز لەسێدارەدەدرێ.

وە هەروەها بەسەرهاتیتریش دەگێڕنەوە لەسێدارەدراوە چونکە هەوڵی ئەوەی داوە یارمەتی مەسیحیەکان بدات، بۆ ئەوەی لەبەندینخانە کوشندەکانی ڕۆمانیەکان ڕزگاریان بێت.

هەروەها دەڵێن: بەر لە ١٧٠٠ ساڵ پێش ئێستا لەو کاتەی کە بتپەرستی بەشێوەکی بەربڵاو لەناو ڕۆمانەکان بڵاوببووەوە،



یەکێک لەقەشەکانیان بەناوی ڤالّانتاین هەڵدەگەڕێتەوە لەئایینی ڕۆمانی و دەبێتە گاور (نەصرانی)، جا دەوڵەتی ڕۆمان کە ئەمە دەزانێ لەسێدارەیدەدەن، ئینجا کە ڕۆژگار تێپەڕ دەبێت و ڕۆمانەکان ئایینی گاور (نەصرانی) وەردەگرن ئەو ڕۆژەی کە ڤالّانتاین لەسێدارەدراوە دەیکەنە بۆنەو ئاهەنگ دەگێڕن، بۆ ئەوەی یادی بەزیندوویی بمێنێت و پەشیمان دەبنەوە لەلەسێدارەدانی...

لەساڵی٣٥٠ ی زایینی لەڕۆما بەمەبەستی بەرزڕاگرتنی ناوی (ڤالّانتاین) و یادکردنەوەی لەو شوێنەی کە تێیدا کوژرا کڵێسایەک درووستکرا، دواتر پیاوانی ئایینی مەسیحی دژ بەم دیاردەیە وەستانەوە، لەناو خودی ئیتاڵیادا کە پێی بەناوبانگبوو ئەم جەژنە هەڵوەشێنرایەوە، بەڵام لەسەدەی (١٨و ١٩)ی زایینیدا دووبارە زیندووکرایەوە.[١]

[١] - https://islamhouse.com/ku




## لەسەرچاوەیەکیتر: ڤالانتاین کێیە؟

زۆرینەی سەرچاوەکان ئاماژە بەئەوە دەکات کە ڤالانتاین قەشە بووە لەماوەی سەدەی ٣ی زاینیدا لەڕۆما ژیاوە، لەسەردەمی چەوساندنەوەی ئایینی مەسیحیدا لەلایەن ئیمپڕاتۆری ڕۆمەوە دەستگیر کراوە، ماڵپەڕە کاسۆلیکیەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە تاوانی ڤالانتاین هاوسەرگیری عاشقانی گاورەکان (نەصرانی) بووە، بەپێچەوانەی فەرمانەکانی ئیمپڕاتۆر کلاودیۆسی دووەم، کە هاوسەرگیری قەدەغە کردبوو چونکە پێی وابوو ئەو هۆکاری بێدڵی لاوانە بۆ خزمەتکردن لەبواری سەربازیدا. هەژمارێکیتر ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو پەیامی لەنێوان مەسیحییەکانی زینداندا گەیاندووە، پێش لەسێدارەدانی وتارێکی بۆ ژنێکی گەنج بەوشەی (لە ڤالانتاین)ەوە بەجێهێشت، ئەمەش وەک ئاماژەیەک کە جیهانی ئەمڕۆ ئیلهامی نەریتی ناردنی کارتی دیاری بۆ عاشقان لەئەوەوە هەڵچوواندوە. بەگەڕانەوە بۆ دەقە مێژووییەکانی دێرین دەرکەوت کە لە١٤ی شووباتدا سێ کەس بەناوەکانی ڤالانتاین گیانیان لەدەستداوە




لەسەردەمی ئیمپڕاتۆری کلاودیۆسی دووەم کە لە٢٦٨ تا ٢٧٠ی ز. بەردەوام بوو، بەڵام هیچ کام لەوانە خۆشەویستێکی ژنیان نەبوو پەیامیان لەنێو زیندانییە نەصرانیەکانیشدا نەگەیاندووە.[١]

لەم سەرچاوەیەدا دەبینین قسەکانیان دژ بەیەکن، باسەکان زۆر تێکەڵکراون و بێسەروبەرییەکی زۆری تێدایە، خۆشیان نازانن ڕاستی ئەم باسە بەتەواوی چییەو چۆنە، لێرە بەدیار دەکەوێت کە ئەم باسە تەنها خورافیاتەو نزیکترە لەئەفسانە وەک لەڕاستی.

**"شوێن ئەفسانە مەکەون**

**واقعیانە ژیان بکەن"**

[١] https://www.bbc.com/arabic

## ڤاڵانتاین لەسەرچاوەیەکیتردا

ڕۆژی ڤاڵانتاین ناوی دوو کەسی بەهەمان ناو " ڤالانتاین "ەو کۆمەڵگەی مەسیحیش لەسەرەتای سەرهەڵدانیدا بە" شەهید " لەپێناو مەسیحیەتدا ناویان دەبەن، دواتر ئەم ڕۆژە بوو بەچەمکی خۆشەویستی ڕۆمانسی.

ئەو دوو قەشە مەسیحییەی لە١٤ی شووباتدا ڕێزیان لێدەگیرێ، ئەمانەن (سەینت ڤاڵانتاین) کە لەڕۆما ژیاوە، هەروەها (سانت ڤاڵانتاین) کە لەشاری (تۆرن) نیشتەجێ بووە، سانت ڤاڵانتاین کە لەڕۆما دەژیا قەشەیەک بوو لەو شارە لەدەوروبەری ساڵی ٢٦٩ی پ.ز. کوژراوەو لەنزیک ڕێگای فلامینا بەخاکسپێردراوە.

سانت ڤاڵانتاین کە لەشاری تۆرن دەژیا، بوو بەقەشەی شاری ئەنترامنا، کە ناوی هاوچەرخی شاری تۆرنی ساڵی ١٩٧ی پ.ز. بوو، باس لەسەردەمی چەوساندنەوەی گاورەکان دەکرێت لەسەردەمی ئیمپڕاتۆر ئۆریلیان، هەروەها لەنزیک (ڤیا



فلامینا) نێژراوە، پاشماوەکانی لەکلێسای سانت ڤاڵانتاین لەشاری تۆرن نێژرا.[1]

[1] - https://www.mobtada.com



## لەسەرچاوەیەکیتر؛ قەشە ڤاڵانتاین کێ بوو؟

سەرلێشێواوییەکی زۆر هەیە، ئەوەی ڕۆژی پشووەکە (ڕۆژی ڤاڵانتاین) ئاماژەی بۆ دەکات کڵێسای کاسۆلیکی سێ قەشەی هەبووە بەناوی ڤاڵانتاین‌و دیارنییە کام لەو سێ ڤاڵانتاینە بەرپرسن لەئاهەنگەکانی بەناو ڕۆژی ڤاڵانتاین.

ئەفسانەکان بانگەشەی ڤاڵانتاین دەکەن بەوەی کە قەشەیەکبووە بەنهێنی هاوسەرگیری بۆ سەرباز و خۆشەویستەکانیان ئەنجامداوە لەکاتی جەنگدا، کە ئەوەش قەدەغەبووە لەحوکمی ئیمپراتۆری عەلمانی کلاودیۆسی دووەم .

سانت ڤاڵانتاین لەزیندانێکی ڕۆمانی پڕ ئەشکەنجەدا زیندانیکرا، لەوێدا عاشقی کچێکی نادیار بوو (کە باوەڕ وابوو کچی داواکاری گشتی بێت).

نامەیەکی خۆشەویستی بۆ نارد کە نووسی " لەڤالّانتاینی تۆوە" ئیمزاکراوە پێش لەسێدارەدانی، بەم شێوەیە نیشانەی ڕۆمانسی دروستکرد کە لەئەمڕۆدا بەکاردەهێرنر،یّ زۆر کەس لەڕاستی ئەم ئەفسانەیە دڵنیانین لەگەڵ ئەوەشدا (سانت ڤالانتاین) وەک پاڵەوانێکی میهرەبانی ڕۆمانسی وێنا دەکەن.[1]

[1] https://www.expatica.com/




## لەسەرچاوەیەکیتر؛ زیاتر لەیەک ڤالێنتاین هەبووە!!

لیستی ئەو کوژراوانەی کە هەبووە ئاماژە بەئەوە دەکات کە سێ ڤالێنتاین بوونیان هەبووە، ئەوانیش ئەمانەی خوارەوەن:

یەکەم: لەو سێ کوژراوە فەرماندەی سەربازی بووە لەئەفریقیا، لەبارودۆخێکی نادیاردا بە هێزێکی ٢٤ سەربازییەوە کۆچی دوایی کردووە.

دووەم: ڤالێنتاینی قەشەی شارۆچکەی تێرنی نزیک ڕۆما بووە .

سێیەم: قەشەیەکی ڕۆمانی بووەو هەرلەوێ کۆچی دوایی کردووە.

هەردووکیان بەوە ناسراون توانای نائاساییان هەبووە بۆ چاککردنەوەی نەخۆشەکان و دەمەقاڵێکردن لەگەڵ فەرمانڕەواکانی پاگان.[1]

---

[1] https://www.bbc.com/arabic

## لەسەرچاوەیەکیتر؛ ڤاڵانتاین لەچییەوە سەرچاوەی گرتووە؟

سەبارەت بە ڤاڵانتاین و سەرچاوەی سەرهەڵدانی ئەو ڕۆژە، چەندین بۆچوونی جیاواز هەیە. یەکێک لەبۆچوونەکان ئەوەیە پاش بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت و هاتنی ڕۆمانەکان بۆ ناو ئایینی مەسیحیەت، ڕۆمانەکان لەسەر ئاهەنگگێڕان بەبۆنەی "جەژنی خۆشەویستی"یەوە بەردەوامبوون، بەڵام لەچەمکە بتپەرستییەکەی خۆیان (خۆشەویستی ئیلاهی) گواستیانەوە بۆ چەمکێکیترو بەگەواهیدەرانی خۆشەویستی گوزارشتیان لێدەکرد.

لەسەدەی سێی زایینی و سەردەمی "ئیمپراتۆریی ڕۆم"دا، سەرکردەیەک هەبوو بەناوی "کلاودیۆسی دووەم" کە حوکمڕانیی ڕۆمانییەکانی دەکردو بەهۆی سەرقاڵبوونی بەجەنگەوە، ژنهێنانی لەسەربازەکانی قەدەغە کرد، بۆ ئەوەی بەشداریی جەنگەکان بکەن و بەژنهێنانەوە سەرقاڵ نەبن، بەڵام "ڤالەنتین"ی قەشە، ڕووبەڕووی بڕیارەکەی ئیمپراتۆر بووەوە

ژێربەژێرو بەنهێنی گرێبەستی ژنهێنانی بۆ سەربازەکان ئەنجامدەدا.

ئەم قەشەیە بەوە ناسرابوو کە گوڵی دەکردە دیاری بۆ هەموو خۆشەویستەکان، بەتایبەتی ئەوانەی مارەکرابوون، ئەم کارەی دژی ڕۆمانییەکان ئەنجامدەدا، کە لەو سەردەمەدا مارەکردن بەشەرعییەتی مەسیح لەئیتاڵیا قەدەغەکراو بوو چونکە ئایینی مەسیحی پەیڕەو نەدەکرا.

هەرچەندە ڤالانتاین لەلای پاشای کلاودیۆسی دووەم کەسایەتییەکی بەهێزو پەسەند بوو، بەڵام کاتێک کلاودیۆس بەئەو بابەتەی زانی، بڕیاری زیندانیکردنی ڤالانتاینی دەرکرد.

ڤالانتاین لەناو زینداندا عاشقی کچی زیندانیەکە بوو، بەو جۆرەی کە لە ئەفسانەکاندا هاتووە، ڤالانتاین نامەی بۆ ئەو کچە دەناردو لەسەری دەینووسی "لەلایەن ڤالەنتینی تۆوە" ئەو کارەی ڤالانتاین بووە هۆی ئەوەی کە پاشا ڕقی لێهەڵبستێ و بڕیار بدات لەسێدارەیبدا، لەئەنجامدا قەشە بەتاوانی لەیەکتر مارەکردنی ئەو عاشقانە بەپێچەوانەی یاساکانی کلاودیۆسی



دووەمەوە، لە ١٤-٢-٢٦٩ لەسێدارەدرا. بەڵام لەدوای بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی و لەدوای مردنی ڤالانتاین بە ٢٠٠ ساڵ قەشە گێلاسیس بڕیاریدا ١٤ی شووباتی هەموو ساڵێک ببێتە ڕۆژی خۆشەویستیی جیهانی، کە بەناوی "ڤالانتاین"ەوە ناونرا "جەژنی خۆشەویستی"، کە بانگەوازی بۆ خۆشەویستی و ئاشتی دەکرد.

هەربۆیە وەک قوربانی ڕێگەی عەشقی دەناسن و لەو ڕۆژەوە ڤالانتاین وەک هێمایەکی عەشق و خۆشەویستی پێناسە دەکرێ و هەموو ساڵێ لەڕۆژی ١٤ی فێبرایەر عاشقان بەو بۆنەیەوە پیرۆزبایی لەیەکتر دەکەن.

تەسک کردنەوەی خۆشەویستی لەیەک ڕۆژدا، تیرۆر کردنی عەشق و خۆشەویستیە، بۆیە هەموو ڕۆژێکت بکە ڕۆژی خۆشەویستی بۆ خێزان و دەورووبەرت.

## لەسەرچاوەیەکیتر؛ بیروباوەڕەکان دەربارەی جەژنی خۆشەویستی

لەماوەی ئەو جەژنەدا ئەو کچانەی دەگەیشتنە تەمەنی هاوسەرگیری ناویان لەناو کاغەزێکی بچووکدا دەنووسراو دەخرایە شوێنێکی دیاریکراوەوە، پاشان ئەو گەنجانەی ئارەزووی هاوسەرگیریان دەکرد، دەهاتن و هەریەکەیان کاغەزێکی دەردەهێنا بۆ ئەوەی لەدواییدا لەخزمەتی خاوەنی ئەو ناوەدا بوایە.

بۆ ماوەی ساڵێک هەریەکەیان یەکتریان دەناسی و لەکۆتاییدا هاوسەرگیرییان دەکرد.

بەڵام کڵێسا ئەو نەریتەی ڕەتکردەوە، لەو ڕوانگەیەی دەبێتە هۆی تێکدانی ڕەوشتی کچان و کوڕان، ئەم بیروباوەڕە لەوڵاتی ئیتاڵیادا ناوبانگی هەبوو لەوێش سەری هەڵدا.

هەندێک لەدیدو تێڕوانینەکان وا باس دەکەن کە ئینگلیزەکان لەسەدەی پازدەی زایینییەوە ئاهەنگیان دەگێڕاو لەسەدەی هەژدەو نۆزدەدا هەندێ لەوڵاتانی ڕۆژئاوا دەستیان بەئاهەنگگێڕان کرد. پاش ئەوە لەهەندێ کتێبخانەکاندا لەشێوەی کتێبی بچووکدا



بەناوی "کتێبی ڤالەنتین" بڵاوبووەوە، کە هۆنراوەی ڕۆمانسی و پێشنیاری دەربارەی چۆنێتی نووسینی نامەی ڕۆمانسی و سۆزداری و ئەوینی لەخۆ دەگرت، بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانویست کارتی پیرۆزبایی و خۆشەویستی بۆ خۆشەویستەکانیان بنێرن.[1]

ئافرەت نابێ ناوی لەناو شوێنێکی بچووک بێ و بەسوکایەتییەوە ناوی ڕابکێشرێ و حەزەکانی لەسەر تێر بکرێت، بەڵکو دەبێ ئافرەت ناوی لەناو دڵ و ڕێزی لەسەری پیاوان بێ و ئافرەت دەبێ (دایـــــــــــک) بێ بۆ نەوەو کۆمەڵگا...

---

[1] Penus

# لەسەرچاوەیەکیتر: بنەڕەتەکانی ڤالێنتاین [1]

(Lisa Bitel) لیسا بیتل پرۆفیسۆری مێژوو ئایین لەزانکۆی باشووری کالیفۆرنیا-دۆرنسێف لەکۆلێژی College of Letters, Arts and Sciences.

دەربارەی ڤالێنتاین دەڵێ:

لە١٤ی شووباتدا خۆشەویستانی هەموو تەمەنێک کارت و گوڵ و شیرینی و دیاری بەناوی (سانت ڤالانتاین) دەگۆڕنەوە، بەڵام وەک مێژوونوسێکی مەسیحیەت دەتوانم پێتان بڵێم لەڕەگی پشووی هاوچەرخماندا سەینت ڤالێنتاین خەیاڵێکی جوانە، بەڵام خۆشەویست و پارێزەری خۆشەویستی نەبوو.

ڕۆژی ڤالێنتاین لەڕاستیدا وەک جەژنێکی ئاینی بۆ پیرۆزکردنی کوژراوێک یان دووکوژراوی مەسیحی لەسەدەی سێ دەستیپێکرد، کەواتە چۆن لەسەربردانەوە (ئەوانەی شت

[1] /https://www.smithsonianmag.com



دەگێڕنەوە) بۆ پیرۆزکردنی ڕۆژی ڤالانتاین ئەو جەژنەمان بەدەستهێناوە ؟

سەرچاوە دێرینەکان ئاشکرای دەکەن کە چەند کەسێ لەشەقامی ڤالّانتاین هەبوون، لە١٤ی شووباتدا گیانیان لەدەستداوە، دووانیان لەسێدارەدران لەسەردەمی ئیمپڕاتۆری ڕۆم کلاودیوس گۆتیکس لە٢٦٩ – ٢٧٠ ز.، لەوکاتەدا کە چەوساندنەوەی مەسیحییەکان باوبوو.

ڕاهیبەکانی بەلجیکا سێ سەدەیان بەسەربرد بۆ کۆکردنەوەی بەڵگە بۆ ژیانی قەشەکان، لەئەرشیفی دەستنووس لەسەرتاسەری جیهانی ناسران بە (Bollandists) بۆلندیسیەکان کە لە Jean Bolland) ) ژان بۆلاندەوە هاتووە.

قوتابخانەی (Jesuit scholar) هەستان بەبڵاوکردنەوەی کارت کە لەسەری نوسرابوو "Lives of the Saints," ژیانی قەشەکان، لەساڵی ١٦٤٣دا.



لەوکاتەوە نەوە یەک لەدوای یەکەکانی ڕاهیبەکان بەردەوامبوون لەکارەکە تا دواچاپ لە ساڵی ١٩٤٠ بڵاوکرایەوە، براکان هەموو زانیارییەکی سەرکەشیی لەسەر هەموو پیرۆزیەک هەڵکۆڵی لەساڵنامەی لیبورگی و ئەو دەقانەی چاپ کرد کە بەپێی ڕۆژی جەژنی پیرۆزیی ڕێکیانخستبوو .



## لەسەرچاوەیەکیتر; ئێمە تەنها کەمێک دەزانین دەربارەی دوو ڤالآنتاینەکەیتر!!

بەپێی ئەفسانەیەکی دواساڵی سەدەکانی ناوەڕاست کە لە "Acta," ئاکتادا دووبارە چاپکراوە، ڕەخنەی بۆڵەندیست لەبارەی بەها مێژووییەکەیی یاوەری کردووە، قەشەیەکی ڕۆمانی بەناوی ڤالانتینۆس لەسەردەمی پاشایەتی ئیمپڕاتۆر گۆتیکسدا دەستگیرکراو کرابووە ژێر چاودێری ئەرستۆکراتێک بەناوی (Asterius) ئەستێریوس، ئەستێریوس لەگەڵ ڤالآنتینۆس دەچێتە ناو گفتوگۆیەک و داوا لەڤالآنتینۆس دەکات ببێتە بتپەرست، لەبەرامبەر ئەوەدا ڤالآنتاین داوا لەئەستێریوس دەکات بڕواتە سەر ئایینی گاور (نەصرانی)ەت.

لێرەدا ئەستێریۆس پەیمانێک لەگەڵ ڤالآنتینۆس دەبەستیَ، دەڵێتە ڤالآنتینۆس ئەگەر مەسیح توانی چارەسەری نابینایی کچە بەخێوکەرەکەی ئەستێریوس بکات ئەوکاتە ئەویش دەچێتە سەر ئایینی نەسرانییەت.



ڤالانتینۆس دەستی خستە سەر چاوی کچەکەو گوتی:

" Lord Jesus Christ, en-lighten your handmaid, because you are God, the True Light”

واتە: ئەی عیسای مەسیحی خاوەن شکۆ، ڕووناکبکەوە چاوی، چونکە تۆ خودای، ڕووناکی ڕاستەقینەی.»[1]

---

[1] گەر ئەمە قسەی ڤاڵانتاین بووبێ کەواتە ڤاڵانتاین موشریک بووە چونکە پێغەمبەر عیسا (علیه السلام)ی بەخودا داناوەو داوای شیفای لەو کردووە، نەک داوای لەخودای تاک و تەنها کردبێ، ئەم داواکردنە گومانی تێدانیە کوفرەو هانا بردنە بۆ جگەلە الله . عن عبد الله بن مسعود -رضي الله عنه- أن رسول الله -صلى الله عليه وسلم- قال: "مَنْ مات وهو يدعُو مِنْ دون الله نِدًّا دخَل النَّار". [صحيح.] - [رواه البخاري.]

لەعبداللەی کوڕی مەسعودەوە -ڕەزای خوای لێبێت- کە پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «هەرکەسێک بمرێت لەسەر پاڕانەوە لەجگەلە خوای گەورە؛ ئەوا دەچێتە دۆزەخەوە، پێغەمبەر -صلى الله عليه

دوای ئەوە بەئاسانی منداڵەکە دەیتوانی ببینێت، بەپێی ئەفسانەی سەدەکانی ناوەڕاست ئەستێریوس و هەموو خێزانەکەی لەئاودا هەڵمژرابوون واتە بوونە گاور (نەصرانی)، بەڵام کاتێک ئیمپڕاتۆر گۆتیکس ئەو هەواڵەی بیست، فەرمانیدا هەموویان لەسێدارەبدەن . بەڵام ڤالانتینۆس تاکە کەس بوو کە سەربڕا.

وە لەشوێنی کوژرانیشی لە (Via Flaminia) ڤیا فلامینا نێژرا، ڕێگای گشتی دێرینە کە لەڕۆماوە درێژبوویەوە بۆ (Rimini) ڕیمینی ئەمڕۆ. دواتر پەرستگایەک لەسەر گۆڕی قەشەکە دروستکرا[1].

---

وسلم- لەم فەرموودەیەدا هەواڵمان پێدەدات بەوەی ئەگەر کەسێک شتێک کە تایبەتە بەخوداو تەنها مافی خودای گەورەیە بیدات بەیەکێکیتر وەکو بۆ نمونە لەم فەرموودەیەدا (پاڕانەوە) باسکراوە واتە لەکەس و شتێکیتر بپاڕێتەوە ئەوا شیرکی ئەنجامداوەو ئەگەر ئەو کەسە لەسەر ئەم شیرکە بمرێت ئەوا چارەنووسی بۆ دۆزەخە.

[1] بڕوانە لاپەڕە ( ١٥٦ ) ئیسلام چۆن دەڕوانێتە ئەو کەسانەی کە پەرستگا و بینا لەسەر گۆڕ دروست دەکەن .



## لەسەرچاوەیەکیتر؛ سەینت ڤالانتاین ڕۆمانسی نەبوو!

دیارە وەک قوتابخانەی بۆلەندیستەکان پێشنیاریان کردووە، لەڕاستیدا دوو ڤاڵانتاینی سەربڕدراو نەبوو، بەڵکو دوو ڤێرژنی جیاوازی ئەفسانەی یەک قەشە لەهەردوو ڕۆما و تێرنی دەرکەوتن، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کام لەڤاڵانتاینەکان وا دەرناکەون ڕۆمانسی بووبن، بەڕاستی ئەفسانەکانی سەدەکانی ناوەڕاست لەمیدیای مۆدێرندا دووبارەی دەکردنەوە، سانت ڤاڵانتاین نەریتی هاوسەرگیری مەسیحی ئەنجامدا یان تێبینی لەنێوان عاشقانی مەسیحیدا دەردەکرد کە لەلایەن گۆتیکسەوە زیندانی کرابوون، هێشتا چیرۆکەکانیتر بەشێوەیەکی ڕۆمانسیانە ئەویان لەگەڵ ئەو کچە نابینایە تێکەڵکردووە کە گوایە ئەو چاکی کردبێتەوە، کەچی هیچ کام لەم چیرۆکانەی سەدەکانی ناوەڕاست هیچ بنەمایەکی لەمێژووی سەدەی سێدا نەبوو، لەهەرحاڵەتێکدا مێژووی وردی مەسیحییەکانی سەدەی ناوەڕاست بایەخی دەدا بەچیرۆکی (خەیاڵی و موعجیزەو قوربانیدان) بەڵام ئەو ڕووداوانەی کە لەڕاستیدا ڕوویاندەدا دەگەڕانەوە بۆ لای قەشەکان تا دڵنیابن کە



کڵێساکان و تەکیەکانی گاورەکان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا کە لەسەری قەشە ڤاڵانتاین لای خۆیان هەیە. بۆ نموونە (Santa MariaSanta) سانتا ماریا لە(Cosmedin) کۆسمەدین لەڕۆما، تا ئێستا کەلـــلەسەرێکی تەواو نیشاندەدات بەوتەی بۆلەندیستەکان، کڵێساکانی دیکەی سەرتاسەری ئەوروپاش بانگەشەی ئەوە دەکەن کە خاوەنی بەشێکیتری جەستەی قەشە ڤاڵانتینۆسن، بۆ نموونە:-

کڵێسای (San Anton) سان ئانتۆن لەمەدرید، کڵێسای (Whitefriar Stree) شەقامی وایتفریار لەدبلن، کڵێسای ( Sts. Peter and Paul) ستس. پیتەرو پۆل لەپراگ، گریمانەی سانت ماری لەشاری چێڵمنوی پۆڵەندا، هەروەها کڵێساکانی ماڵتا، بێرمینگهام، گلاسگۆو لەسەر ئایسلەندا " Greek isle of Lesbos" یۆنانییەکان و لێسبۆس.

مرۆڤەکانی ئەو سەردەمە لەو باوەڕەدابوون کە سەر بەسانت ڤاڵانتاینن، لەکڵێسای سانت جۆرج لەمۆنلیس شوێنکەوتووە



گاورەکان دەچوونە سەر گۆڕی ئەو قەشەیە، چونکە باوەڕیان وابوو کەوا هێشتا کاریگەری و پیرۆزیەکەی ماوە لەسەدەی ١١دا، بۆ نمونە یەکێک لەقەشەکان پێی وابوو کەوا ئەو کەلـــلە سەرەی ڤالّانتینۆسە دەبێتە هۆی ڕێگریکردن لەبڵاوبوونەوەی پەتاو نەخۆشی و چاکبوونەوەی جۆرەها نەخۆشی و هەروەها بەتاڵکردنەوەی جادوو [1].

.ئێستا ئەوەی ئێمە زانیمان ئەوەیە ئێسقانی قەشەکە هیچ شتێکی تایبەتی بۆ عاشقان نەکرد.

پەرستنی لاشەیەکی مردوو و تەبەرووک پێکردنی لەکوێی عەقڵی مرۆڤ شوێنی دەبێتەوە؟

مەگەر مردوو چ کارێکی لەدەستدێ بۆ خۆی ؟!!

تا بۆ زیندووەکانی بکات ؟

---

[1] بـــڕوانە لاپەڕە (١٦١ ) بـــزانە لەئیســـلامدا ئەوانەی تەبەرووک دەکەن بە گـــۆڕو دارو بەرد چ سزایەکیان بۆ هەیە.



شوێنەواری سەینت ڤالانتاینی تێرنی لەباسیلی سەینت ماری لەکۆسمێدین (دیئێنلۆر (کاری خۆیان)،

CC BY-SA



وێنەیەکی تری کەلـــلەسەری ڤاڵانتاین..

## لەسەرچاوەیەکیتر؛ (Chaucer) چۆسەر و باڵندەی خۆشەویستی

پەیوەندی خۆشەویستی ڕەنگە پاش زیاتر لەهەزار ساڵ لەمردنی ڤالانتاین دەرکەوتبێت، کاتێک (Geoffrey Chaucer) جێفری چۆسەر نووسەری کتێبی The Canterbury (Tales) کانتربێری تێڵس، لەجەژنی شووباتی سانت ڤالنتینۆسی لەکاتی جووتبوونی باڵندەکان هەستا بەنووسینی (Parlement of Foules) پەرلەمانەکەی فووڵس. دیارە لەڕۆژی چۆسەردا باڵندە ئینگلیزییەکان جووتبوون بۆ بەرهەمهێنانی هێلکە لەمانگی دوودا . هەر زوو سروشتەکە وای کرد کە خاوەن زمانەکانی ئەورووپی دەستبکەن بەناردنی نامەی خۆشەویستی لەوەرزی جووتبوونی باڵندەدا. بۆ نموونە (Duke of Orléans) ، دوکی ئۆرلینزی فەرەنسی کە چەند ساڵێک وەک زیندانیی لەتاوەری لەندەندا دەستبەسەرکرابوو، لەشووباتی

١٤١٥ دا بۆ هاوسەرەکەی نووسیبووی "پێشتر لەخۆشەویستییەکی بەهێزدابوو لەگەڵی " کەمەبەستی دەربڕینی خۆشەویستی بوو پێیدەگووترا " very gentle Valentine“ ڤالَانتاینە نەرم و نیانەکەم.

کۆمەڵگای ئینگلیزی بیرۆکەی جووتبوونی مانگی شووباتیان لەلا جوانبوو، هەروەکو لەهاملێتی شکسپیر دەردەکەوێت کاتێ ئۆفێلیا ڤالَانتاینی خۆی بۆ هاملێت دەربڕی.

لەسەدەکانی دواییدا پیاوانی ئینگلیزو ژنان دەستیانکرد بەبەکارهێنانی ١۴ی شووبات بۆ دەربڕینی هەستی خۆشەویستییان، چەندین ناوەندی دەرکردن هەستان بەدیزاینی کارتەکان و نوسینی شیعر لەسەری وەک ( Cadbury, Hershey’s) گاد بێری هێرشیزو چەندین کارگەی بەرهەمهێنانی شیرنەمەنی هەڵدەستان بەدروستکردنی چوکولاتەو کێک بۆ ڕۆژی ڤالَانتاین.



## ڤاڵانتاینی نادیار ...

وادیارە ئەو خۆشەویستییە شاراوەیە هەندێ لەقەشەکان وەکو فێڵکردنێک لەخۆشەویستی دەبینن، هەروەکو قەشە ( St. Augustine) ئۆگستین لەسەدەی پێنجەمدا بەشێوەیەکی فەلسەفی گاڵتە بە (باوەڕ بەشتە نەبینراوەکان) دەکات، دەڵێت: پێویست ناکات شتێکمان خۆشبووێ کە ئێمە ناتوانین ببینین، هەروەک ئەوەی ئێستا هەیە لەخۆشەویستیدا.

هەروەها ناوبانگی ڤاڵانتاین ئەوەندە گرنگ نییە لەخۆشەویستی وەک ئەوەی کە گرنگە لەباوەڕی ئایینی گاورەکاندا[1].

---

[1] - https://www.smithsonianmag.com/



## کێ زیاتر گرنگی بەڤالانتایندا ؟

هەرچەندە لەوانەیە مەسیحییە سەرەتاییەکان ئەو ڕۆژەیان پیرۆز کردبێت، بەڵام تا سەدەکانی ناوەڕاست پەیوەندی بەخۆشەویستی و ئاڵوگۆڕی دیارییەوە نەبوو .

نووسەرانی ئینگلیز چۆسەرو شکسپیر بەزۆری بەرپرسن لەبڵاوکردنەوەی ناوبانگی ئاهەنگگێڕان لە بەریتانیا و شوێنەکانیتری ئەورووپاو جیهان بەشێوەیەکی گەورە .

نەریتی ئاڵوگۆڕی کارت لەنێوان عاشقاندا لەسەدەکانی ناوەڕاستدا باش زانرابوو، بەڵام لەسەدەی نۆزدەیەمدا بوو بەبازرگانییەکی پڕ قازانج، کە شۆڕشی پیشەسازی بەشداری کرد لەدابینکردنی کارتی دروستکراودا .[1]

---

[1]- https://www.bbc.com/arabic

## لەسەرچاوەیەکیتر؛ مێژووی ڕۆژی ڤاڵانتاین، پاگان یان مەسیحی؟ !

پێش بوونی ڤاڵانتاین بتپەرستە ڕۆمانییەکان لە١٤ی شووبات یادی ئەم ڕۆژەیان کردووەتەوەو جەژن و ئاهەنگیان بۆ سازکردووە، بەناوی جەژنی " لوپەرکالیا".

جەژنی "لوپەرکالیا" چۆن بووە ؟

خەڵکەکە کۆمەڵێ گەنجیان هێناوە سەگێک و بزنێکیان سەربڕیووەو خوێنی سەگ و بزنەکەیان لەلاشەی دوو گەنج داوە، دوایی هاتوون بەشیر خوێنەکەیان شوشتووە[1]، ئەم کارەیان لەپێناو پیرۆزکردنی گورگ کردووە، ئەمەش لەبەر دووهۆکار:

یەکەم: ڕۆمانەکان پێیان وابوو (ڕۆمیلیۆس) دامەزرێنەری ( ڕۆما) بەمناڵی گورگێک شیری پێداوە لەگەڵ ئەم شیرپێدانە هێزو

---

[1] - کاتێ بەشیر شۆردراون بەکوڵانەکاندا گەڕاون، ئەو ئافرەتانەی نەزۆک بـوون خۆیـان بەو گەنجانەدا دەخشاندو خۆشیان وەردەگرت، هەروەها بڕوایان وابوو نەزۆکیەکەیـان نامێنێ بەم خۆپێداخشاندنە، سبحان الله لەم هەموو خورافیاتە.



بیرکردنەوەو ڕاجوانی پێبەخشیوە، بۆیە ڕۆمانەکان لەناوەڕاستی مانگی (فبرایر)ی هەموو ساڵێک جەژنیان دەگێڕاو داب و نەریتەکانی ئەو ڕۆژەش بریتی بوو لە ( سەربڕینی سەگێک و بزنێک).

دووەم: ڕۆمانە کۆنەکان لەم جەژنەدا قوربانییان سەردەبڕی بۆ خواکانیان، کە بریتی بوون لەچەند بتێک، و پێیان وابوو ئەم (بتانە) لەشەڕ دەیانپارێزێ.[1]

دوای ئەوە ئەم گەنجانە کۆبونەتەوەو ئەو کچانەشی کە کاتی شوویان بووە کۆیان کردونەتەوەو گەڵای داریان هێناوە ناوی کچەکانیان لێنووسیوە، گەڵاکەیان پێچاوەتەوەو خستویانەتە ناو سندوقێکەوە، پاشان ئەم سندوقەیان گێڕاوە بەناو گەنجەکاندا، گەنجەکانیش هەریەکەو گەڵایەکی هەڵگرتووە، جا ناوی هەرکچێکی بۆ دەرچووبا بۆ ماوەی ساڵێک بەیەکەوە دەبوون و ڕابواردنیان دەکردو لەخزمەت یەکتر دەبوون، دوای ساڵەکە

---

[1]- بڕوانە لاپەڕە (١٧٠ ) ئیسلام چۆن دەڕوانێتە قوربانیکردن بۆ بتەکان و بۆ جگەلە الله.



هەریەکەیان دەچنەوە ماڵی خۆیان، دوای ئەوە دیسان کە کاتی ئەم جەژنە دەهاتەوە دووبارە ناوی کچان دەنوسرانەوە و دووبارە ناوەکان ڕادەکێشرانەوە، جا دووبارە ناویان بۆ پیاویتر دەردەچوو بۆ ماوەی ساڵێکیتر دەکەوتنە دەستی جۆرە پیاوێکیتر .

بۆ ئەم مەبستەش کارتێکی بچوکی بەدیاری بۆی دەنارد کە لەسەری دەنوسرا: بەناوی خودای دایکەوە ئەم کارتەت بۆ دەنێرم، بەڵام پاش ئەوەی خاچپەرستی لەئەوروپا بڵاوبووەوە هەندێ لەقەشەکان بۆ گۆڕینی داب و نەریتی کۆنی جەژنی ڕۆمانە بتپەرستەکان لەئەوروپا بڕیاریاندا ڕستەی (بسم إله الأم) واتە: بەناوی خودای دایکەوە بگۆڕن بۆ ناوی (قەشە ڤالانتاین)، چونکە هێمای خاچ پەرستییەو بەهۆیەوە زیاتر لاوان پەیوەستدەکەن بەخاچ پەرەستییەوە. و ئەم جۆرە جەژنەو خۆشەویستییە لای ڕۆمانییەکان بێڕیزیکردن و شکاندنی شکۆو بێنرخکردن و هەڕاجکردنی ئافرەتەکان بووە نەک دەربڕینی خۆشەویستی و هاوسەرگیریەکی پتەوو جوان.

ئەم جەژنە "لوپەرکالیا" لەکۆتاییەکانی چلەکان بەفەرمی بەیاسا کرا، کاتێک پاپا گێلاسیۆس جێگەی خۆی کردەوە بەدیاریکردنی ١٤ی شووبات بەڕۆژی سەینت ڤالانتاین.

١٤ی شووبات ئاماژە بۆ ئەو مێژووە دەکات کە مردووە یان ئەگەری هەیە بوونی هەبووبێت، چونکە مەسیحییەکان پێویستیان بەشوێنگرەوەیەک هەبوو بۆ ڕۆژی لوپەرکالیایە، بۆ ئەوەی جەژن و ئاهەنگبگێڕن و خۆشی دەرببڕن.



## بۆچی ڕۆژی کوپیدو ڤالّانتاین بەیەکەوە ؟!

مێژووی ڕۆژی ڤالّانتاین بەبێ کوپید تەواو نەدەبوو بەڵام چ پەیوەندییەک هەیە لەنێوان کوپیدو ڕۆژی ڤالانتایندا؟

بەپێی بیروباوەڕیان جاران کوپید فریشتەیەکی بچووک و جوان بوو، تیری خۆشەویستی بەرکەوتبوو لەلایەن خوداوەندێکی جوانی یۆنانییەکان بەناوی ئیرۆس، ڕۆمانییەکان بوون کە وایان کرد کۆپید ببێتە ئەو ڕەمزەی کە ئێستا هەیە، هیچ بەڵگەیەکیش نییە کە ئیرۆس چۆن بەوە ڕازی بووە. (کوپید ئەو منداڵە باڵدارەیە کە ناوچاوانێک و دوو تیری زێڕینی هەیە، بەیەکێک لەگرنگترین سیمبووڵەکانی ڤالّانتاین دادەنرێت) کۆپید کوڕی ڤێنوسە خواوەندی جوانیی و خۆشەویستییە لەلای ڕۆمانییەکان[1].

لەسەر بەشێکی کارتی خۆشەویستی وێنەی منداڵێکی لەسەرە دووباڵی هەیە تیرو کەوانێکیشی پێیە ئەوە ناوی کوپیدە.

---

[1] https://www.cbc.ca/kidscbc٢/the-feed/the-story-of-cupid



لەبەر ئەوە گوتویانە ئەم تیرە بدا لەسەر دڵی هەرکەسێ هەڵیئەوەشێنێ و تازە لەدەست خۆشەویستی ڕزگاری نابێ.

لەناو ئێمەشدا دەبینین عاشقەکان وێنەی دڵێک و تیرێک دەکەن کە بەناو دڵەکەدا ڕۆیشتووە، ئەوەش مانای کۆپید دەگەیەنێ کە لەدەستی ڕزگارت نەبووە.

بەکوردی واتا کاتێ نەزەر دەکەیت و کچێک دەچێتە دڵتەوە ئەوە واتا تۆ عاشق بوویت و تیری عەشقت بەرکەوتووە، بێگومان ئەو تیرەش تیری شەیتانە، وەک پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێ :-

سەیرکردن و نەزەرکردن یەکەم قۆناغی خۆشەویستیە، تیرێکە لە تیرەکانی شەیتان.

بۆیە دەبینی ئەم کوپیدە مناڵە کە دوو تیرەکەو دوو باڵەکەی هەیە بەدەوری وێنەی دڵێکی سووردا دەسوڕێتەوە کە لەناویدا خاچێک هەیە، تازە خاچیان تێدا دروستکردووە، واتە تۆ لەچوارچێوەی ئەم خاچ و ئەم عیسا لەخاچکردنەیەدا[1] دەسوڕێیتەوە.



وێنەیەکی کوپید کە لەسەر کارتی نامەی خۆشەویستی دادەنرێن .



وێنەیەکیتری کوپید.



## لەسەرچاوەیەکیتر؛ قەشە ڤاڵانتاین وەک چارەسەرکاری نەخۆشی نیشان دەدات، لەژێر ناونیشانی ئایا ڤاڵانتاین پەیوەندی بەخۆشەیستی و ڕۆمانسیەتەوە هەیە؟!

بەپێی ژیاننامەی قەشەکان کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی پێنج و شەش، ڤاڵانتاین قەشەی تیرنی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی (صەرع ـ پەرکەم یان گەشکە)ی کوڕی دەزگیرانێک بەناوی کراتۆن بانگکراوە بۆ ڕۆما .

کراتۆن کە گوێی لەتوانای ڤاڵانتاین بوو بۆ چارەسەرکردنی هەمان حاڵەت ،بانگهێشتی دەکات.

کاتێک ڤاڵانتاین چاوی بە کراتۆن کەوت بانگهێشتی کرد بۆ ئەوەی بڕواتە سەر ئایینی مەسیحییەت، بەڵام کراتۆن ئامادەنەبوو ببێتە مەسیحی و ڕەتیکردەوە، دوای مشت و مڕیەکی زۆر گەیشتنە ڕێکەوتن، ڕێکەوتنەکەش لەلایەن دەستگیرانی ئۆرتیپۆتی کۆچکردووەوە پێشنیار کرا، کە خێزانەکەی

مەسیحییەتی لە باوەش گرت لەکاتی سەرکەوتنی قەشە لەسارێژکردنی نەخۆشیەکەدا.

قەشە ڤالانتاین شەوەکەی بەنوێژکردن(نوێژکردنی تایبەت بەخۆیان) بەسەر برد بۆ کوڕی کراتۆن تا ڕۆژی دواتر گەنجەکە تەندروست و حاڵی باشتر بوو، کە خێزانەکەی ئەمەیان بینی دەستبەجێ هەموویان بەپەلە ڕازی بوون و بوون بەمەسیحی .

زۆری نەبرد هەواڵی ڕووداوەکە گەیشتە ئەنجومەنی پیرانی ڕۆمانیا، فەرمانی دەستگیرکردنی ڤالانتاین دەرچوو، ڤالانتاین دەستگیرکراو دواتر فەرمانی سەربڕینی بۆ دەرچوو .



ژیاننامەی قەشەکە ئاماژە بەوە دەکات شاگردەکانی بۆ گواستنەوەی تەرمی ڤالانتاین بۆ شارۆچکەی تیرنی چووبوون، لەلایەن سەربازانی ڕۆمەوە دەستگیرکراون و ئەوانیش بەچارەنووسی خۆیان گەیشتوون.[1]



وێنەی ڤالانتاین، قەشەی تیرنی، بانگکرا بۆ ڕۆما بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی کوڕی دەستگیرانێک بەناوی کراتۆن.

---

1- https://www.bbc.com/arabic

## لەسەرچاوەیەکیتر؛ ئاگاداربە تۆ فریو دەدرێی بۆ ئەوەی بچیتە سەر ئایینێکی درۆ!!!

ژیاننامەی ئەو ئاماژە بەوە دەکات کە ڤالانتاین قەشەیەکی خەڵکی ڕۆما بووە، لەسەر ئەوەی لەسەردەمی ئیمپڕاتۆری کلاودیۆسی دووەمدا بەهۆی بانگەوازکردن بۆ مەسیحیەت دەستگیرکراوە.

کلودیۆس لەڕۆمای پایتەختدا کاتی زۆری بەسەرنەبردووە سەرقاڵ بووە بەشەڕکردن لەگەڵ داگیرکەری ئەڵمانی و هیچ کات فەرمانی بەچەوساندنەوەی مەسیحییەکان نەکردووە، هەرچی ڤالانتاین بوو بۆ تورەکردنی حکومەت لەبەردەم کلاودیۆسدا دەرکەوت و بانگەوازیکرد بۆ ئایینی مەسیحیەت، کلاودیۆس سەرەتا حەزی بۆ وشەکانی ڤالانتاین دەربڕی، بەڵام پارێزگارێک بەناوی کالبورنیۆس ئیمپڕاتۆرەکەی ئاگادارکردەوەو



گوتی: ئاگاداربە، تۆ فریو دەدەرێیت بۆ ئەوەی بچیتە سەر ئایینێکی هەڵە.

کلۆدیوس ڤالآنتاینی لەماڵی ئەریستۆکراتێک بەناوی ئەستێریوس بەند کرد، دوای ئەوە بەسامانێکی زۆر بەڵێن بەو کەسەدرا ئەگەر بتوانێت بەگفتوگۆی دژە مەسیحی قەشەکە ڕابگرێت و لەگفتوگۆکە لەڤالآنتاین بباتەوە. بەڵام ڤالآنتاین هەر کە پێی لەماڵی ئەستێریۆس دانا دەستیکرد بەبانگەوازیکردن بۆ ئایینی مەسیحیەت و گفتوگۆکە دەستیپێکرد.

پاش گفتوگۆیەکی زۆر ئەستێرۆس داوای لەڤالآنتاین کرد گەر کچە کوێرەکەی بۆ چاک بکاتەوە ئەوا ئەو دەبێتە مەسیحی.

ڤالآنتاینیش دەستی خستە سەر چاوی کچەکەو تا ڕووناکی بینی دوعای بۆ کرد، ژیاننامەکە لەماوەی سەدەی ٥ی زاینیدا نووسراوە، و ئاماژە بەوە دەکات کە ڤالآنتاین سەرکەوتوو بووە لەوەی ئەستێریۆس و ٤٤ کەس کە لەماڵەکەیدا بوون بیانکاتە



مەسیحی، کاتێک ئیمپڕاتۆر کلاودیۆس بەئەمەی زانی هەموویانی دەستگیرکرد، فەرمانی سەربڕینی ڤاڵانتاین و ئەوانەی دەرکرد کە باوەڕیان بەمەسیحییەت هێناوە لەسەر دەستی ڤاڵانتاین .[1]

---

[1] - https://www.bbc.com/arabic



## لەسەرچاوەیەکیتر; ڤالآنتاین بانگەوازکار  یان ڕۆمانسی !!!

ساڵی "١٩٦٩" کە پێداچوونەوە بەساڵنامەی قەشەکانی کاسۆلیکی ڕۆمانیدا کرا، ڕۆژی ئاهەنگگێڕانی سانت ڤالآنتاین لە " ١٤"ی شووبات لەساڵنامەی ڕۆمانی لابراو زیاد کرا بۆ ڕۆژمێری ناوخۆیی و تەنانەت نەتەوەییەکانیتریش، چونکە بەپێچەوانەی ناوی سانت ڤالآنتاین کە ئەم یادە لەخۆ دەگرێت، هیچ زانیارییەکی دیکەی زانراو نییە لەسەر ئەم قەشەیە جگەلە ناشتنی لەنزیک ڕێگەی ڤیا فلامینا لە١٤ی شووباتدا.

سانت ڤالآنتاین بەهۆی باوەڕبوونی بەمەسیحییەت دەچەوسێتەوەو لەلایەن خودی ئیمپراتۆری ڕۆمانی کلاودیۆسی دووەمەوە لێپرسینەوەی لەگەڵ کراوە .

سانت ڤالآنتاین سەرسام بوو بەکلۆدەکان، کە لەگەڵی چووە گفتوگۆیەک کە تێیدا هەوڵیدا باوەڕ بەسانت ڤالآینتاین بێنێت و ڕوو لەبتپەرستی بکات کە ڕۆمانەکان باوەڕیان پێی هەبوو بۆ مانەوە، بەڵام سانت ڤالآنتاین ڕەتیکردەوەو لەبری ئەوە هەوڵیدا



کلاودیوس ڕازی  بکات بۆ ئەوەی ئەو بڕواتە سەر دینی مەسیحییەت.[1]

ئەوەی جێی سەرنج و تێبینییە ئەوەیە کە هیچ کام لەو سێ قەشەیە پێش سەدەی پێنجەمی زاینی نەنووسرابوون، بەلایەنی کەمەوە دوای ٢٠٠ ساڵ لەو ماوەیەی تێیدا ژیاون نووسراون.

هەروەها هیچ بەڵگەیەکی فیزیکی و نووسراو نییە بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش سەدەکانی ناوەڕاست و ڤالآنتاین بە خۆشەویستەوە ببەستێتەوە، ڤالآنتاین قەشەی تیرنی نەخۆش چارەسەرکار بووەو پەیوەندی نەبووە بەخۆشەویستییەوە.

لەماوەی ئەو چەند سەدەیەی کۆتایی بۆ نەخۆشیە بێچارەسەرکان خەڵکی دەڕۆیشتن بۆ سەردانیکردنی گۆڕەکانیان بۆ تەبەرووک و داوای چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانیان لێیان دەکرد[2]، خۆشەویستانی ڕۆمانی ڤالنتین هەر لەسەرەتای سەدەی

---

[1] - https://www.mobtada.com

[2] بڕوانە لاپەڕە (١٦١ ) لەباسی تەبەروک کردن و حوکمی تەبەروککردن



چواردا کلّێسەیەکیان لەسەر گۆڕەکەی دروستکردو دەروازەی شارەکەیان بە دەروازەی ڤالّانتاین ناونا، کە ئەمڕۆ بەپۆرتا دێل پووپۆلۆ ناسراوە. لێکۆڵەرانی ئەدەبیی هاوچەرخ گۆڕینی ڤالّانتاین بۆ ڕۆژی عاشقان دەگەڕێنێنەوە بۆ هۆنراوەیەک کە شاعیری ئینگلیزی (جێفری چۆسەر) لەساڵی ١٣٨٠دا بەشەرەفی ڕیچاردی دووەم پاشای ئینگلتەرا لەیەکەم مارەبڕینەکەیدا لەگەڵ ئانی شانشینی بۆهێمیا وتوویەتی: "لە ڕۆژی ڤالّانتاین کاتێک هەر باڵندەیەک دێت بەدوای گەلّایەک بۆی بگەڕێت، لەسەرەتای بەهاری ئینگلیزیدا" خوێنەرانی هۆنراوەکە بەهەڵە وایان دانابوو کە چۆسەر ڕۆژی ١٤ی شووبات وەک ڕۆژی خۆشەویستی (ڤالّانتاین) ئاماژەی پێدەکات .



عاشقان لەنوسینی نامەو بۆ گۆڕینەوەی کارتەکان ئیلهامیان لەهێمای ڕۆمانی وەرگرتووە وەک کوپید.

لێکۆڵینەوەکانی ئەم دواییە ئاماژە بەوە دەکەن کە هیچ پەیوەندییەک لەنێوان سانت ڤالانتاین و خۆشەویستی و ڕۆمانسیەتدا بوونی نییە، پێش ئاماژەکەی چۆسەر ئەوەی دواییان کاریگەری زۆری بەدەست هێناوە، ئەو لەسەردەمی پێش سەدەکانی ناوەڕاست، پێش سەردەمی شکسپیر، وەکو بەرچاوترین شاعیرانی ئینگلیزی ئەژماردەکرا .

دوای پەخشی شیعرەکەی، هەمووان ڕوویان لەگۆڕینەوەی نامەی خۆشەویستی کرد، لە ١٤ی شووبات سانت ڤالانتاین پیرۆزکرا، کە وای کرد دڵدارێک خۆشەویستی بێت، گلەیی لەئازارو



ئازارەکانی ویژدان و دابڕانی خۆشەویست بکات، شانۆکەی هاملێت بۆ شاعیری ئینگلیزی ویلیام شکسپیرو هەروەها پاڕانەوەکەی ئۆفلیا بۆ سانت ڤالآنتاین ئاماژەکەی بۆ ڕۆژی ڤالآنتاین دەپارێزێ تا سەدەی نۆزدەیەم، عاشقان لەنامە دەستنووسەکان و گۆڕینەوەی کارتەکان کە بە شیعری خۆشەویستی دانراوە ئیلهامیان وەرگرت لەهێما ڕۆمانییەکانی وەک (کوپیدی کوڕی ڤینۆس) خواوەندی خۆشەویستی و جوانی لە میتۆلۆژیای ڕۆمانیدا، ئاڵوگۆڕی کارتی سڵاوکردن بەزۆری بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا درێژبووەتەوە، دوای ناوبانگی بازرگانی کارتی سڵاو گەشەی کرد بۆ ئاڵوگۆڕی گوڵ و چوکلێت کە بەپارچەی سوورو دیاری دیکە پێچرابوو، نەریت و بازرگانی هەردووکیان بوونە هەموو دیارییەک کە پیاوان بەئافرەتانیان دەدا، جگەلە ئەوانەش هەموو دیارییەک لەخۆ دەگرێت، لەدەیەی ١٩٨٠دا دیاری خشڵ و خشڵی بەنرخ لەنێوان

ئەریستۆکراتیکدا باو بوو، تەنانەت  دیاری ئەڵماس لە ١٤ی شووباتدا هەبوو ئێستاش هەیە[1].

---

١- https://www.bbc.com/arabic



## ناردنی کارت و نامەی خۆشەویستی

### بەبازاڕکردنی ناوبانگ:

هەرچەندە لەوانەیە مەسیحییە سەرەتاییەکان ئەو ڕۆژەیان پیرۆز کردبێت، بەڵام تا سەدەکانی ناوەڕاست پەیوەندی بەخۆشەویستی و ئاڵوگۆڕی دیارییەوە نەبوو .

نەریتی ئاڵوگۆڕی کارت لەنێوان عاشقاندا لەسەدەکانی ناوەڕاستدا باش زانرابوو، بەڵام لەسەدەی نۆزدەیەمدا بوو بەبازرگانییەکی پڕ قازانج ، کە شۆڕشی پیشەسازی بەشداری کرد لەدابینکردنی کارتی دروستکراودا، لەساڵی ١٩١٦دا کۆمپانیایەکی کارت بەناوی "هاڵمارک" لەویلایەتی میسۆری ئەمریکا دەستیکرد بەدروستکردنی کارتەکانی ڤالانتاین، کە سروشتی ئاهەنگگێڕانی لەسەرتاسەری جیهاندا گۆڕی، کۆمپانیاکە بووە بەشێک لەپیشەسازییەک کە بەو بۆنەیەوە ١٣٢ ملیۆن کارت دەفرۆشێت، ئەمڕۆ ڕۆژی ڤالانتاین بووە دەرفەتێک بۆ بازرگانییەکی پڕ لەقازانج لەسەرانسەری جیهاندا، بەتایبەتی لەئەمریکا بەپێی ڕاپرسی خەرجی بەکارهێنەرانی ڕۆژی

ڤالآنتاینی یەکێتیی نەتەوەیی بۆ بەسەربردنی بەکاربەر چاوەڕوان دەکرێت ئەمریکا بڕی (١٨,٩) ملیار دۆلار بۆ دیاری و کارتەکانی ڕۆژی ڤالآنتاین خەرج بکات. تێکڕای خەرجی کەسێکی ئەمریکی لەئەم بۆنەیە نزیکەی ( ٣١,١٤٢)دۆلارە .

لەئەنجامدانی ئەم کارەدا هەندێک پێیان وایە ئەم ڕۆژە ڕەهەندی ئایینی و شیعری و بازرگانی هەیە[١].

لەسەرچاوەیەکیترەوە[٢] شارەزایانی ئابووری لەو بڕوایەدان ڕۆژی ڤالآنتاینی ٢٠١٩ (٢٠ ملیارو ٧ سەد ملیۆن دۆلار) بۆ ئابووری ئەمەریکا زیادکرد. ئەم ڕێژەیە لەساڵی ٢٠١٨ (نۆزدە ملیارو ٢ سەد ملیۆن دۆلار) بوو. لەسەدا ٥١ی دانیشتوان ئەم بۆنەیە یاد دەکەنەوە کە زۆربەیان گەنجانی تەمەن ١٨ بۆ ٢٥ ساڵانن.

لەئەمەریکا بەشێوەیەکی گشتی هەرپیاوێک کە ئەم بۆنەیە یاد دەکاتەوە نزیکەی ٢٠٠ دۆلار خەرج دەکات و خانمانیش نزیکەی ٩٠ دۆلار. باوترین دیارییەکانی ڤالآنتاین بریتین

---

[١]- https://www.bbc.com/arabic

[٢] /https://www.dengiamerika.com



لەنەستەلە، پۆستکارت، ڕۆشتنە دەرەوە بۆ نانخواردنی ئێوارە، گوڵ.

ڕۆژی ڤاڵانتاین لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمەوە دەستیپێکرد، کە بازرگانە ئەمریکییەکان نەریتێکی ئایینی باویان کردە بۆنەیەکی هاوچەرخ . ڕەنگە زۆر کەس ئەوە نەزانن کە ئەو بۆنەیە بەپشووی مەسیحی دەستیپێکرد بۆ یادکردنەوەی قەشەیەک بەناوی ڤاڵانتاین.[1]



کارتی سڵاوکردنی سەدەی ١٩

[1]- https://www.bbc.com/arabic



## مێژووی کارتی ڕۆژی ڤالانتاین چیرۆکێکی مۆدێرنتر

هەرچەندە لەماوەی پشووی سەدەی پێنجەمدا سلاوی دەنگی ئالوگۆڕکرا، بەلام نووسین و ناردنی کارتەکان نەبوونە کرداری باو تا سالی ١٤٠٠ کە دوکی ئۆرلیەنز لەتاوەری زیندانی لەندەنەوە نامەی بۆ هاوسەرەکەی نارد، هەر زوو (king Henry V) پاشا هێنری ڤی بە بەکرێگرتنی نووسەرێک چووە پال ڕەوتەکە بۆ ئەوەی کارتی ڤالانتاین بۆ کاترینای خۆشەویستی بنووسێت.

کاتێک ڕۆژی ڤالانتاین لەسالانی ١٦٠٠کان لەئەمریکاو لەسالانی ١٧٠٠دا زیاتر لەئینگلتەرادا بەناوبانگتر بوو، سلاوی دەستنووس و هەروەها دیاری بچووک زیاتر باوبوو.

(Esther Howland) ئیستیر هاولاند یەکەم کارتی ڤالانتاینی ناو مالی دروستکردو وێنەی گول و خۆشەویستی لەسەر دانا، چاپکردنی مۆدێرن بەشێوەیەکی گەورە جێگەی نەریتی دەستنووسی گرتەوە لەسالانی ١٩٠٠دا، لەسالی ١٩١٣دا



(Hallmak) هاڵمارک دەستیکرد بەیەکەم کارتی باج بەرهەم هێنراوی ڤالانتاین[1].

ئەمانەی کە باسکران چەند چیرۆک و ئەفسانەیەک بوون دەربارەی ژیانی ڤالانتاینەکان کە لەسەرچاوەکانی خۆیانەوە وەرمانگرتبوو...

ئێستا بابزانین ڤالانتاین و خۆشەویستی لەکوردستان چۆنەو چۆن یاد دەکرێتەوە؟.

و لەڕوانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە باس لەناوەڕۆکی ئەم ڕۆژە دەکەین و بەووردی تیشکی دەخەینەسەر.

---

[1] - https://www.expatica.com/



## ڤالانتاین و خۆشەویستی لەکوردستان

لەهەرێمی کوردستان بەشێکی زۆر لەگەنجان و پیاوو ئافرەتی خێزاندارو بەداخەوە بگرە بەشێکی بەناو بانگخوازانیش کاریگەرن بەم یادەو یادی ڕۆژی جیهانی بەناو جەژنی خۆشەویستی "ڤالانتاین" دەکەنەوەو چەند ڕۆژێ زووتر ڕاگەیاندنەکانی سەر بەعەلمانیەت بۆ خزمەت و باسکردنی ئەو ڕۆژە دەستبەکاردەبن و ڕێکلامی بۆ دەکەن و ئامادەکاری زۆر بۆ چەندین بەرنامە دەکەن تا ئەم باسە بخەنە نێو هەموو ماڵێکی موسڵمانەوەو هێندە بەجوانی ئەم ڕۆژە باسدەکەن و دەیڕازێننەوە تا وەها لەهەرچی موسڵمانە دەکەن ئەو ڕۆژە بەئاسایی وەربگرن و چەواشەیان دەکەن، دواتریش پەلکێشیان دەکەن بۆ بەشداریکردنیان لەو ئاهەنگە.

جگەلە ئەمە لەخوێندنگاکان بەگشتی ئامادەکاری دەکرێ بۆ ئەم ڕۆژەو بەگۆرانی و مۆسیقاو سەماو هەڵپەڕکێ پێشوازی لەم ڕۆژە



دەکەن، ئەمەش لەکاتێکدایە ئەو یادە نە لەڕووی دین نە عورف و نە کەلتور هیچ پەیوەندییەکی دوورو نزیکی بەئەم میللەتەوە نییە.

وە باسکردن و ڕاکێشانی خەڵک بۆ ناو ئەو یادە جگەلە بڵاوکردنەوەی بەدڕەوشتی و بەلاڕێدا بردنی موسڵمانان و شێواندنی بیروباوەڕیان و دوورخستنەوەیان لەئیسلام هیچیتر نییە، یادکردنەوەی ئەم ڕۆژە لەکوردستان جیاوازە وەک لەشوێن و وڵاتەکانیتر، چونکە بەپێی ئەو بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە مەیدانیی و ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە لەڕێی تۆڕە کۆمەڵایەتیەکانەوە ئەنجامداوە، بۆم دەرکەوت هیچ یەک لەو خۆشەویستییانە لەسەر بنەمایەکی شەرعی و پاک و جوان و عیشق نەبوون، بەڵکو ئەو جۆرە خۆشەویستییە و بەشداریکردن لەو جۆرە یادە تەنها بۆ کات بەسەربردن و پڕکردنەوەی بۆشایی ژیان و تێرکرنی حەزوو ئارەزووەکان و دروستبوونی خراپەو بەدڕەوشتی و تێکچوونی پاکی کۆمەڵگا هیچ شتێکیتر نەبوو .



## باسێکی کورتی هەردوو لێکۆڵینەوەکە:-

**یەکەم:** لێکۆڵینەوەیی مەیدانی.

**دووەم:** لێکۆڵینەوە لەڕێی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان.

## یەکەم: لێکۆڵینەوەیی مەیدانی:

لەئەم لێکۆڵینەوەیەم بەربەست و کۆسپی زۆرم لەپێش بوو تا بتوانم چەند کەسێک بدوێنم و قسەم بۆ بکەن، تایبەت کچەکان ئەمەش لەبەر ترسی دروستبوونی مەترسی بۆ سەر ژیانیان، بەڵام هەرچۆنێک بێت چەند کەسێکمان دواند، لەبەرامبەریشدا کوڕەکان زۆر بەئاسایی و بێترس ئامادەبوون قسە بکەن.

لەسەردانێکمان بۆ قۆناغەکانی ناوەندی و ئامادەیی و کۆلێژو پەیمانگاکان چەند لێدوانێکمان وەرگرت لەسەر پەیوەندی خۆشەویستی و ڕۆژی ڤالانتاین .

یەکێک لەو کچانەی قسەی بۆمان کرد تێکشکاویی دەروون و لەرزینی ناخی کاریگەری خستبووە سەر لەرزینی دەنگ و دەست و پەنجەکانی و بەشێوازێ قسەی کرد تا کۆتایی



قسەکانی ڕووی نەهات چاوو سەری بەرزبکاتەوە، لەبەر کاریگەری ئەو ڕووداوەی ژیانی کە کاریگەریەکی هێندە گەورەی لەسەر ناخ و دڵ و دەروونی دروستکردبوو، لەبەر هەستکردن بەشەرمەزاری، لەبەر هەستکردنی بەدۆڕان لە ژیانی .

گوتی: من کچێکی جوان و گوێڕاڵی دایە و بابەی خۆم بووم، تا ساڵێ پێش ئێستا کە دەستم بۆ خۆشەویستی نەبردبوو.

ساڵێ پێش ئێستا کوڕێکی ڕێکوپێک و پۆشتە چەند جارێ هاتە سەر ڕێگام بەڵام سەرەتا هیچ گوێم پێی نەدا، خەریکی خوێندن و ئەرکی خۆم بووم، چەند هاوڕێیەکی کچم هەبوو ئەوان بەردەوام قسەیان لەگەڵ کوڕان دەکردو باسی خۆشەویستی و عەشق و ئەو شتانەیان بۆ من دەکردو منیان بەدواکەوتوو ناو دەبرد چونکە خۆشەویستیم بۆ کەس نەبوو .

ئەو تێکەڵبوونە لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەم و قسەکانیان کاریگەریان لەسەر من دروستکرد، تا وەهای لێهات منیش دەستم بۆ... (بەچاوێکی پڕ فرمێسکەوە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا) ...کەمێ وەستا لەقسەکردن هەناسەی تەنگبوو تا چەند خولەکێک هیچی بۆ نەگوترا .



دوای چەند خولەکێک دەستی بەقسەکردن کردەوەو گوتی:
لەگەڵ ئەو کوڕە کەوتمە گفتوگۆو نامە گۆڕینەوەو خۆشەویستیمان ڕۆژانە بۆ یەکتر دەردەبڕی .
ماوەیەک بەردەوامبووین تا گەیشتینە مانگی دوو، نزیکبووینەوە لەڕۆژی ڤالانتاین، ئەو کوڕە زۆر زیاتر هاتە پێشەوەو باسی هاتنە خوازبێنی و هاوسەرگیری دەکرد، قسەکردنی لەگەڵم زۆر زیادی کرد، لەلایەکی تریش هاوڕێ کچەکانم باسی ڕۆژی ڤالانتاینیان دەکردو باسی دەرچوونیان دەکرد لەگەڵ خۆشەویستەکانیان، ئەو شتانە هەمووی وای کرد منیش دەرچوونم لەلا ببێتە شتێکی ئاسایی لەگەڵ ئەو کوڕە.
١٤-٢ کاتژمێر حەوت و نیو بوو ئەو کوڕە تێلی کرد منیش ناو پاس بووم بەرەو خوێندنگە، وەڵامم دایەوە ... وەڵام دانەوەیەک ... ئاخێکی هەڵکێشا ... گوتی: خۆزگە ئەو ڕۆژە بمردبام بەسەربەرزی نێژرابام نەک وەک ئێستا هەموو چرکەیەکم مەرگەو مەزارگەیەکیش نییە لەخۆیم بگرێ .

گوتی: وەڵامم داوەو پێی گوتم نەچمە ژووری خوێندن و دێتە دوام تا پیاسەیەکی چەند خولەکی بکەین و بەڵێنیدا زوو بمگەڕێنێتەوە.

کە هات لەسەیارە لەگەڵی سەرکەوتم و ڕۆیشتین، کەمێک دوور کەوتینەوە گوڵێکی سووری پێدام و منیش وەرمگرت، لەبەر دڵخۆشیم داوای ماچی کرد منیش پێمداو هیچ بەرهەڵستییەکم نەکرد.

منی بردە شوێنێ کەمترین ئۆتۆمبێلی پێدا دەڕۆیشت گوتی:

لێرە کەمێک قسە دەکەین و دەڕۆین، ئەوە بوو دەستی بەقسەکردن کردو هێندەی خەیاڵی جوانی خستە ناو مێشکم هێندەی ژیانی لەپێش چاوم جوان کرد، خۆمم بیرچوویەوە.

کاتێ خۆمم بینیەوە منی لەبەردەم خوێندنگەکەم دانا کە بەئاسانی نەمدەتوانی لەبەر ئازاری لاشەم هەنگاو بنێم، بەحاڵ خۆم گەیاندەوە ماڵێ و بەفێری خوێندن چوومە ژوورێک بەتەنها و مۆبایلەکەم داخست.

بۆ بەیانی هاتە سەرڕێم و بەتوڕەییەوە قسەی کرد کە بۆچی مۆبایلم داخراوە، پێیم گوت: تکایە گەر منت خۆشدەوێ یان



وەرە داوام یان وازم لێبێنەو بڕۆ دەرێ لەژیانم، تۆ کارێکت لەگەڵ من کرد لەژیانم بیرم بۆی نەدەچوو تۆ پیست کردم .

گوتی: تۆ گەر ڕەوشتت هەبا نەتدەهێشت دەستتلێبدەم من کچی بێڕەوشتم ناوێ.

کە ئاوای گوت بوورامەوەو کەوتم، کە هاتمەوە سەرخۆم ناو ئۆتۆمبێلی ئەو بووم، دواتر دابەزیم و ڕۆشتم، بەڵام هەستم دەکرد گیانم تەڕە سینگم تەڕەو ئاسایی نییە.

کە پرسیارم لێیکرد بەمۆبایل گوتی دووبارە هەمان کاری لەگەڵ کردووم لەو کاتەی بێهۆش بووم، وە وێنەو ڤیدیۆشی گرتووم.

لەو کاتەوە تا ئێستا بەردەوام هەڕەشەم لێدەکات گەر بەردەوام و هەرکاتێ ویستی لەگەڵی دەرنەچم و خۆم نەدەمە دەستی وێنەو ڤیدیۆم بڵاودەکاتەوە، بەڵام من ژمارەکەم گۆڕیوەو پشتگوێم خستوەو خۆم داوەتە دەست خودا.

ئێستا هەموو ژیانم بووەتە قەلەقی، مردوویەکی گەڕۆکم، بەردەوام ئاواتی مەرگ دەخوازم، بۆیە چاوەڕێم خودا گیانم بکێشێ، یان وێنەو ڤیدیۆم بڵاوبێتەوەو خزم و کەسەکەم بێن و گیانم دەربێنن، تا لەم ئازارە قورسە دەربازم بێ.



**خوشکی سەنگینم: تۆ بڕبڕەی پشت و هێزی ڕاوەستانی باوکتی، ئەو باوکەی بەدرێژایی تەمەنی ئارەقەی بۆ ڕشتی و هێزی خۆی بەتۆدا بۆیە لەژێر هیچ ناوو ناونیشانێک پشتی مەشکێنەو مەبە هۆی سەرکزکردنی.**

ئەوەو چەندان چیرۆکیترم گوێگرت و چەندین ڕووداویتر ڕوویانداوە لەشوێنە چۆڵ و دوورەدەستەکان، بەڵام ئەو ڕووداوە بەسە بۆ کەسێک کە بیەوێ بیربکاتەوەو خۆپارێزی بکات لەتاوان و کەوتنە هەڵەوە.

ئەمجارەیان لەگەڵ کوڕەکان کەوتمە قسە، هەموویان بێمنەتی و دڵڕەقیان پێوە دیار بوو، وە قسەکانی هەمووشیان یەک واتایان هەڵدەگرت، ئەویش تێرکردنی حەزو ئارەزوو دواتر دەستبەرداربوون و پشتتێکردن.

یەکێک لەکوڕەکان کە تەمەنی سەرووی بیست ساڵان بوو گوتی:

من لەتەمەنی چواردەو پانزە ساڵییەوە لەگەڵ کچانم و قسەیان لەگەڵ دەکەم، تا ئێستاش داوێنپیسیم لەگەڵ زیاتر لەنۆ کچ کردووەو هەمووشیان بەڵێنی هاوسەرگیریم پێدان و ئێستا وازم لەهەموویان هێناوە.

ئەو کارانەشم بۆ ئەوە دەکرد بێئیش و کاربووم، کاتەکانم بەئەوان بەڕێدەکردو حەزەکانم لەئەوان بەتاڵدەکردەوە، بەهەرشێوەیەک کە بمویستبا ئاوا داوێن پیسیم لەگەڵ دەکردن، گوتی:

من کەسم نەکردە ژن بەڵام هاوڕێم هەبوو پەردەی کچێنیشی لاداوەو دووگیانیشی کردووە، دواتر بەزۆرو هەڕەشەی توند سکەکەی پێ لەبار بردووەو دوای ئەوەش وازیلێهێناوە.

دڵنیابە دەرچوونی کوڕو کچ لەڕۆژی ڤالانتاین هیچ سەلامەتییەکی بۆ کچان تێدا نییە، من چەندین هاوڕێم هەبوو کە دەردەچوون لەو ڕۆژە هیچیان نەبوو بڵێ من هیچم نەکردووەو دەستم لەکچەکە نەداوە، ئیلا بەجۆرێ لەجۆرەکان دەستگەمەو



دامرکاندنەوەی شەهوەتی تێدابووەو دوای ئەوەش سوکایەتی بەکچەکە کراوەو وازیلێهێنراوە .

دەربارەی دروستبوونی مەترسی لەسەر ژیانیان گوتی:

ئێمەی کوڕ مەترسیەکی ئەوتۆ لەسەر ژیانمان نەبووەو نابێ، چونکە ئێمە پەردەی کچێنیمان نییە تا لێی بترسین یان بەهەر شێوازێکی تری سێکسکردن بۆ ئێمە نە زیان نە ئێش و ئازارمان پێناگا، نە لەڕووی جەستەیی و نە لەڕووی دەروونییەوە.

بەڵێ زەرەرمەندی یەکەم لێرە ئافرەتەو بەس، جا لەهەر ڕوویەکیەوە سەیری بکەی ڕووخان و ئابڕووچوون و کوشتن و خۆکوشتنیش.

بێگومان ئەو جۆرە خۆشەویستییە تەنها کچی نەگرتووەتەوە بەڵکو ژنانی هاوسەردارو خاوەن منداڵیشی گرتووەتەوە، دوایی کە ئاشکرا بووە ژنە کوژراوەو کەسێ نەبووە دڵۆپێ فرمێسکیشی بۆ بڕێژێ، پیاوەکەش لێی دەرچووەو هیچ سزایەکی وەها نەدراوە مەگەر سزایەکی ماددی نەبێ .

ئەرێ بەڕاست ڤالانتاین ڕۆژی خۆشەویستیە یان بەدڕەوشتی ؟!!

برای بەڕێزم: بۆ خۆشییەکی کاتیی و دونیایی خۆت ژیانی کچێک لەگۆڕ مەنێ لەژێر ناوی دروستکردنی خۆشەویستی و خێزان .

دووەم : لێکۆڵینەوە لەڕێی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان :

لەتۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بابەت و بەسەرهاتی سەیروسەمەرە دەبینی و گوێ بیستیان دەبیت، هەژمارێکم دروست کردو چەند کەسێکیان بۆم دەستنیشانکردو قسەم لەگەڵیان کرد، لێرەش زیانمەندی یەکەم هەر کچ و ئافرەتەکان بوون کە لەڕێی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە بەقسەی ڕازاوەو کۆمەڵێ بەڵێنی درۆو بێبنەما هەڵخەڵەتێنرابوون.

لەڕێی ئەو هەژمارەی دروستمکرد بەسەرهاتی کچێکیان بۆناردم کە چۆن بووەتە قوربانی ئەم ڕۆژە کە ڤالانتاینە، منیش نامەکەم وەکو خۆی بێدەستکاری دانا .

کچێکی تەمەن ( ١٧ ) ساڵ!!

لەسەرەتای بەهاری تەمەنیەتی و کچێکی گەنج و تازە پێگەیشتو !کچێکی بێ تاوان کە تازە دەست دەکات بە دروستکردنی هیواو دروستکردنی دنیای خەیاڵ دروست کردنی داهاتوو بەڵام دەبێتە یەکێك لە قوربانیەکانی ڕۆژی خۆشەویستی !!چاکتر بڵێم.. ڕۆژی ناشتنی خۆشەویستی!!

ڕۆژێک نامەیەکی ماسنجەر هات!!

سڵاوێکی گەرم و داوای هاوڕێیەتی کرد کە گوایە کەسێکی باشە و وەکو کوڕانی تر نیە سەرەتا خۆمم گران کرد و ڕەتم کردەوە و بلۆکم کرد بەڵام بەئەکاونتێکی ترنامەی نارد و زۆر گریا و داوای هاوڕێیەتی کرد کە گوایە منی کەوتۆتە دڵ و من کچێکی جیاوازم وبەڕەوشتم منیش کەوتە دڵمەوەو هاوڕێیەتیەکەیم قبوڵکرد بەڵام ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر هۆگر بوم وڕۆژبەڕۆژ زیاتر خۆشەویستیم لەچاوەکانی دەبینی ، ئەوکاتەی داوای وێنەیەکی کرد و منیش



گوتم ئەو خۆشیدەوێم و دەیەوێ بمبینێ چی تێدایە!! وێنەی خۆمم بۆی نارد زۆر سەرسام بوو پێم وتێلی کرد گوتی خۆم بۆنەگیرا زۆۆۆۆر جوانییی!! هەر ئەوڕۆژە بووبەڕۆژی ڕەش بۆم.

من کچێکی تەمەن ( ١٧) ساڵ بووم کاتێك تازە هەستم کرد کەئیتر گەورەبووم!! ئیتر پێویستە وەکو هاوڕێکانم هاوڕێی کوڕم هەبێت ..

ئیتر پێویستم بەدایك و باوك و،برام نیە! ئیتر پێویستە کەسێك هەبێت ڕۆژانە قسەی ڕۆمانسی و خۆشم بۆبکات ڕۆژانە بە نامە و تەلەفۆن قسەی خۆشم بۆبکات! ، ئیتر پێویستە دیاریم بۆ بێت وەکوهاوڕێکانم، بەیانیان بە نامەیەکی خۆشەویستی خەبەرم ببێتەوە! ڕۆژبەڕۆژ باسی خۆشەویستی وڕۆژ بەڕۆژ وێنەی زیاترو هۆگربونی زیاتر، ئیتر وای لێهات کە هەموو ڕۆژێك وێنەیەکی جیاوازی بۆبنێرم و ئەویش وێنە بنێرێت وردە وردە بەدزیەوەدیاری بۆدەهێنام وشتی بۆم دەکڕی، دەی گوت هەڵیگرە بۆ ڕۆژانی هاوسەرگیری و بەنەوەکانمانی نیشان بدە منیش تەواو باوەڕم کرد، باوەڕم کرد کە ئیتر ئەوە خۆیەتی ! ئەوە ئەو کوڕەیە کەدەبێتە خۆشەویستی ژیانم و هەموو کەسێکم، بەڵام نەمزانی

کەدەبێتە تارمایی تاهەتایی بۆ تەواوی ژیانم ، ڕۆژێك ویستم بچمە لای بۆ پیاسەیەك بە بەهانەی ماڵی هاوڕێیەکم بەڵام ماڵەوە نەیان دەهێشت منیش تێلم بۆی کردو گوتم نایەم بەڵام گوتی تەنیادەمەوێ بتبینم و تەواو، منیش هەرچۆنێك بێت ماڵەوەم ڕازی کرد و لەگەڵی چومە پیاسەیەك ئەویش لێم نزیك بویەوە وماچێکی ڕوومەتی کردم و ووتی مەترسە .. من وەك کوڕانی تر نیم!!! ئیتر هەستم بەئارامی کرد لەگەڵی.

چەند جارێکی تر بەهەمان شێوە چونەدەرەوەمان هەبوو تا وای لێهات هەفتەی دوو ڕۆژ دەچومە دەرەوە لەگەڵی باسی ژیانی هاوسەری و منداڵی خۆمان دەکرد، من ئیتر چومە خەیاڵەوە ئیتر ژیانێکم بنیاد نا لەگەڵی ئەوڕۆژەی بوە ١٤ /٢ ڕۆژی خۆشەویستی!!!

گوتی وەرە شوێنی جاران و دێمەدوات بەهەمان شێوەی ڕۆژەکانی تر دەچین بۆپیاسەو سوپرایزم بۆت هەیە، منیش بەدڵێکی خۆش خۆم ڕازاندەوە وبەماڵەوەم گوت لەگەڵ هاوڕێکانم دەچین بۆ پیاسە، چوومە شوێنەکەی جاران و ئەویش هاتە دوام بە ئۆتۆمبێل منیش بێ ترس سەرکەوتم نەمزانی بەرەو

چالَی مەرگم دەبەن!!، چوینە شوێنێکی چۆڵ من زۆرترسام گوتم ئێرە کوێیە؟گوتی مەترسە عەیبە لەهاوسەری داهاتوت بترسیت منیش گوتم باشە کە گەشتینە شوێنەکە بینیم بەگوڵ ڕازاوەیە وامزانی داوای هاوسەرگیری دەکات!

کەچوینە ژورەوە بینیم لەناکاو دەرگا داخرا و دوو سێ پیاوی تر لە ژورەوە بوون قیژاندم گوتم ... ئەمە چیە ؟؟ئێرە کوێیە،؟ ئەوانە کێن؟

ئەویش گوتی ئێرە ماڵی داهاتوتە! ئەوەندەم زانی چاوم داخرا و کە هەستامەوە چیم بینی!!! لەم ژورەتاریکەدا و بەتەنیا وبەبێ جل ! کە تەلەفۆنم بۆی کرد داخرابوو !!، ئیتر بێ هەواڵ بوو!

بەڵێ... ئەوان دەست درێژیان کردە سەرم

ئێستا چی بکەم؟

بۆکوێ بچم؟

چی بەماڵەوەبڵێم؟

ئیتر شوێنێك نیە بۆژیان

شتێک نیە بەناوی خۆشەویستی، ئیتر تاهەتایە بەفرمێسکی سارد ژیان دەمەبەسەر!!، ئیترهاوسەرگیری نیە ڕووی ئەوەم نیە بڵێم

شوو دەکەم ، ئێستا کە ٣١ ساڵم!!، وادەزانم هەموو ڕۆژێك دەست درێژیم دەکرێتە سەر، ئیتر ژیان ڕەشە لەبەرچاوم ئیتر بەم تاوانەوە تاهەتایە بەڕوێکی ڕەش سەیری الله و خێزانەکەم دەکەم!!، ئیتر هیچ خەونێکم نیە ، توانای بەدیهێنانیم نیە.

خوشکی سەنگینم: ڤاڵانتاین ڕۆژێکە، بەڵام پەشیمانی و دۆڕاندنت تاهەتا کۆتایی نایە...

بەڵێ ...

لاساییکردنەوەی بۆنەیەکی هاوردەکراوی وەک ڤاڵانتاین دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە ئێمە وابەستەو کەمەندکێشی دونیای دەرەوەی خۆمانین، ئەگینا فەلسەفەی ڤاڵانتاین و داب و نەریتی کۆمەڵگای ئیسلامی و کوردەواری لەکوێ؟! ڤاڵانتاینێکی بێسەروبەرو ئەفسانەیی لەکوێ؟!

ئایا ئەم بۆنەیە چەندە دەمانبەستێتەوە بەڕابردوومان!؟

چەندە تەباو کۆکـە لەگەڵ ژیان و گوزەرانی پێشینانی ئەم گەلە ؟!

ئەم دوو ڕووداوەی باسکران مشتێکە لە خەرمانێک ئەم ڕووداوانە بەرهەمی ڕاگەیاندن و پەروەردەی عەلمانیەتە کە دەرخواردی ئەم میللەتەی دەدەن و موسڵمانانیش بێبیرکردنەوە شوێنیان دەکەون، وە عەقڵی خۆیان دەدەنە دەست ئەوان و ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان یاری بەهەست و بیروباوەڕو ڕەوشتیان دەکەن، چۆنیان بوێ ئاوا بەسەر ئەو میللەتە دێنن، وەک چۆن ئێستا بەسەریان هێناون .



## خۆشەویستی یان حەز ( ئارەزوو ) لەکوردستان

خۆشەویستی: هەستێکی جوانەو ژیان جوان دەکات بەڵام بەو مەرجەی ئەم خۆشەویستییە ڕاستی بێت و بۆ پاراستنی کەسەکە بێت، نەک ئەو جۆرە بەناو خۆشەویستییەی کە بۆ کەسێکی دەربڕی بۆ مەبەستی تایبەتی خۆت، جا ئەو مەبەستە لایەنی جنسی بێ یان بۆ پارەو سامان بێ یان بۆ مەبەستێکی دیاریکراو بێت.

دەبێت ئەم خۆشەویستییە بەجۆرێک بێ کە لەپێناو دولبەردا هەموو ئەو شتانەت خۆش بووێ کە پەیوەندی بەئەووەوە هەیە، دەبێ ئەم خۆشەویستییە واتلێبکات کاریگەر بی بەبوون و نەبوونی نەوەک هیچیان بۆ تۆ هیچ بایەخێکی نەبێ، دەبێت بەجۆرێک بێ بتەوێ ئەو کەسە هاوبەشی ژیانت بکەیت و لەخەم و نارەحەتی بەدووری بخەیت، گەر بەم جۆرە نەبوو ئەوا خۆشەویستی نییە، بەڵکو حەز لێبوونە.



حەز : یاخود ئارەزوو بریتیە لەهەستێکی کاتی، کە دوای ئەنجامدان و دامرکاندنەوەی حەزەکە ئیتر ئارەزووت بۆی نامێنێ و ناتەوێ ئەو کەسە لەلات بمێنێ و پێویستت پێی نامێنێ تا دووبارە گەڕانەوەی ئەو حەزە، کە ئەمەش پێچەوانەی خۆشەویستییە، خۆشەویستی جار لەدوای جار زیاد دەکات و بەتێپەربوونی کات دەمێنێتەوە.

بەداخەوە دەڵێم ئەوەی ئێستا لەکوردستان هەیە بەگشتی پەیوەندییەکان بۆ تێرکردنی حەزو ئارەزووە، کاتێک کچ و کوڕێک دەبینین کە زۆر بەتوندی ئاڵوودەی یەکتر بوونەو نامەو چوونە دەرەوە لەنێوانیان زۆرە بەڵام پاش ماوەیەکی کەم لەیەکتر جیادەبنەوە، گەر ووردبینیەکی بچووک بکەین دەبینین بەشێکی زۆر ئەوانەی هاوسەرگیریش دەکەن پاش ماوەیەکی کەم لەیەکتر جیادەبنەوە، چونکە حەزو ئارەزوویان بۆ یەکتر تێر دەبێ و چیتر پێوویستیان بەیەکتر نامێنێ .

هەتا ئەو پیاوو ئافرەتانەی هاوسەردارن کۆمەڵێکی ئەوانیش شوێن خۆشەویستی دەگەڕێن لەدەرەوەی پەیوەندی



هاوسەرگیرییەکان، بەکوردی خەریکی ناپاکین، ئەوانیش کاتێ پەیوەندی دەبەستن هەر بۆ حەزو ئارەزوو دەیبەستن جا هەر ڕۆژەو لەگەڵ کەسێک وە بەڵگەشمان زۆر زۆرە بەداخەوە.

کەواتە جیاوازیەکە هەر ئەوەیە کە خۆشەویستی تاهەتایە بەردەوام دەبێ و بگرە زیاتریش دەبێ، بەڵام حەز تا ئەو کاتەیە کە تێربوو دوای ئەوە جیابوونەوەو هەندێک جار ڕقیش دروستدەکات لەنێوان کەسەکان .

کەواتە ئەمەیە جیاوازی خۆشەویستی و حەزو ئارەزوو زۆر گرنگە ئەم دوو چەمکە لەیەکتر جیابکرێنەوە، کە ئەمڕۆ ئەم میللەتە لێکی جیا ناکاتەوە.

عەشق و خۆشەویستی واتا ڕێزو قوربانیدان و لەگەڵ یەکتربوون، نەک تێرکردنی حەزو ئارەزوو وازهێنان و ئابڕوو بردنی یەکتر.

## خۆشەویستی و چاولێکەری!

چاولێکەری یان لاساییکردنەوە بەبەشێ لەسروشتی ژیان و مرۆڤ دەستنیشاندەکرێت. ئەرستۆ لەکتێبی (هونەری شیعری) دەڵێت: هونەر لاساییکردنەوەی سروشتە .

کەواتە لاساییکردنەوە سروشتی مرۆڤە بەڵام گەر ئەو لاساییکردنەوە بەردەوام بێت و کەسەکە بەبەردەوامی خوو بەم لاساییکردنەوەیەوە بگرێت ئەوا ئەو مرۆڤە کەسێکی کۆپییە!

لەم سەردەمە زۆر بەڕوونی دەبینین میللەتی کورد نەوەیەکی کۆپیکراوی بەرهەمهێناوە، بەردەوام لاسایی وڵاتان دەکاتەوە لەئەو شتەی کە لەگەڵ هەوەس و ئارەزووەکانی دەگونجێ لەبۆنەو ئاهەنگ و سەماکانیان و لەجلوبەرگیان، نەک لەزانست و داهێنانەکانیان.

لەڕۆژی ڤالآنتاین وەکو هەموو ئەو شتانەیتر کە لاساییان دەکەنەوە ، هەڵدەستن بەئامادەکاری بۆ ئەم ڕۆژە، بەبێ ئەوەی بزانن ناوەڕۆک و بنەڕەتی ئەم ڕۆژە چییەو لەچییەوە هاتووە، تەنها



وابیردەکەنەوە ئەو وڵاتانە بەئاهەنگ و بۆنەکانیان پێش کەوتوون و بەجلە سفوورەکانیان گەیشتونەتە لووتکە، لەکاتێکدا ئەمە زۆر دوورە لەڕاستییەوە، بەڵکو ئەوان بەخوێندن و زانست پێش کەوتوون، بەداهێنانەکانیان گەیشتونەتە لوتکە، جگەلە ئەمانەش هەتا لەناوخۆیان کاتێک کەسێک دەبینن دەڵێ خۆشەویستم هەیە یان پەیوەندیم لەگەڵ فلانەکەس هەیە ئەوا خێرا ئەمیش هەڵدەستێ بەدرووستکردنی پەیوەندییەکی لەم جۆرە، هەتا ئەگەر هیچ هەست و سۆزی خۆشەویستی ڕاستەقینەی بۆ ئەم کەسە نەبێ بەلایەوە گرنگ نییە، ئەوەی بۆ ئەو گرنگە بوونی کەسێکە بەناوی خۆشەویستی، چوونە دەرەوەیەتی لەگەڵی لەڕۆژی ڤالانتاین و کڕینی گوڵی سوورە، یاخود تەنها بۆ ئەوەی بڵێ لەم ڕۆژە گوڵی سورم بۆ هاتووە ئەم پەیوەندیە دادەنێت، بەداخەوە ئەم جۆرە چاولێکەریە لەنێو چینی هەرزەکاران زۆر باوەو بووەتە مۆدێل، ئەگەر خۆشەویستییەک بۆ چاولێکەری بێت ئەبێ ئەنجامی چی بێت و چاوەڕێی چی لێدەکەی؟!!

زۆرێک لەخەڵکیتر هەڵدەستن بەیادکردنەوەی ئەم ڕۆژە بەکڕینی گوڵ و ورچ و کارت و چوونە دەرەوە، چونکە وابیردەکاتەوە کە یادکردنەوەی ئەم ڕۆژە واتا نیشانەیەکە بۆ ڕۆشنبیری! لەکاتێکدا یادکردنەوەی بۆنەیەک کە لەنزیک و دوور هیچ پەیوەندییەکی بەڕۆشنبیرییەوە نییە بەڵام ئەم جۆرەیان پێیان وایە ئەمە ئاهەنگێکی سەردەمیانەیەو تایبەتە بە کەسە شاهانەکان، و شانازی دەکات گەر یادی رۆژێک بکاتەوە کە هیچ لەئەتەکێتی ئایین و نەتەوەکەی نییەو بگرە زۆریش لێی دوورە، ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ کەموکوڕی و گێڕی پەروەردە.

ئەنجامی هەموو چاولێکەری و لاساییکردنەوەکان بێ بوونی زانست و بەکارهێنانی عەقڵ گومانی تێدا نییە زیاندمەندییە.

# ڕۆڵی ڕاگەیاندنی کوردی لەڕۆژی ڤالانتاین

بەگشتی زۆرێک لەڕاگەیاندنەکان بۆ هەر باس و بابەتێک کە بێتە پێش زیاتر ڕۆڵی چەواشەو فێڵکردن دەبینن تایبەت ڕاگەیاندنە عەلمانیەکان.

لەباسی ڤالانتاینیشدا ڕاگەیاندنەکان ئامادەکاری زۆر و ڕیکلامی زۆر دەکەن و سپۆنسەری زۆری بۆ کۆدەکەنەوە تا بگاتە بەردیدی زۆرترین خەڵک و پارەی خەیاڵی سەرف دەکەن بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ ئەم ڕۆژە تا لەژێر ناوی ڕۆشبیری و تێگەیشتوویی و ڕۆمانسیەت بەشداری یادکردنەوەی ئەم ڕۆژە بکەن.

ڕاگەیاندنەکانی جیهان و کوردستانیش لەباسی ڤالانتاین تەنها باسی ئەو ڤالانتاینە دەکەن کە کاتێ ئیمپڕاتۆر کلاودیۆس هاوسەرگیری قەدەغەکردووە، قەشە ڤالانتاین هاتووە خۆشەویستەکانی بەیەکتر گەیاندووەو لەپێناو خۆشەویستان گیانی خۆی بەخشیوە، باسی دوو ڤالانتاینەکەیتر ناکەن کە یەکێکیان لەئەفریقیا لەگەڵ کۆمەڵێ سەرباز وونبووەو کوژراون

یان ئەو ڤالّانتینەی لەپێناو بانگەوازیکردن بۆ مەسیحییەت گیانی بەخشیووە، ئەمانجیان لەباسکردنی تەنها ئەو ڤالّانتاینەی کە بۆ بەیەکتر گەیاندنی خۆشەویستان گیانی بەخشیووە تەنها بۆ ئەوەیە ئەم میللەتە لەڕێی خۆشەویستییەوە بەرەو هەڵدێر بەرن وەک ئێستا کە پلانەکانیان پێکاوەو ڕووەو هەڵدێر بردوویانن، بەباسکردن و گەورەکردنی ناوی ڤالّانتاین گەنج و لاوانێکی زۆریان خەڵەتاند، لەژێر ناوی خۆشەویستی تووشی سەدان دەردو نەخۆشی و لادانی ڕەوشتییان کردن، بەڕازاندنەوەو جوان باسکردنی ئەو ڕۆژە هەزاران سەری بەرزیان بەکچان شۆڕ کرد، هەزاران پەردەی پاکیان لاداو پیسیان کردن، ناخی گەنجەکانیان پڕ ژەهر کرد، شەرم و شکۆی کۆمەڵێک ئافرەتیان شکاند،داوێن پیسیان بڵاوکردەوە، فەسادیان لەم زەویە پاکە بڵاوکردەوەو پیسیان کرد .

بەشێکی زۆری ڕاگەیاندنەکان شیرەمژەی عەلمانین جگەلە چەواشەو هەڵخەڵەتاندن و بڵاوکردنەوەی بەدڕەوشتی و لادانی فیکری هیچیتر نین.

## شێوازی یادکردنەوەی ئەم ڕۆژی ڤالانتایە لەڕاگەیاندنەکان

ڕاگەیاندنەکان بەدووشێوازی سەرەکی یادی ئەو ڕۆژە دەکەنەوە .

شێوازی یەکەم: لەڕێی بەرنامەکان .

دووەم: چاوپێکەوتن .

سێیەم: فیلمەکان .

### یەکەم: لەڕێی بەرنامەکان:-

تیڤیەکان لەڕۆژی ڤالانتاین بەرنامەسازی زۆر دەکەن بەکۆکردنەوەی گەنجان لەستۆدیۆو ناو ستۆدیۆ دادەپۆشن و دەڕازێننەوە بە میزەلان و گوڵ و جلوبەرگی سوور، وە دانانی گروپێکی میوزیک تا لەڕێی چڕینی شیعرو ئاوازی سۆزداری سەرنجی بینەرو ئامادەبووان زیاتر ڕابکێشن و مێشکی گەنجان زیاتر بەلای خۆیاندا کەمەندکێش بکەن، وە بانگکردنی ئەو گۆرانیبێژانەی کە ژمارەیەکی زۆری خەڵکی گوێگریەتی، ئەو



گۆرانیبێژەش بەکۆمەڵێ گۆرانی بێواتاو بێهەست گۆرانی دەچڕێ و ئامادەبووان و بینەریش چەپڵەی بۆ لێدەدەن و بۆی هەڵدەپەڕن، لەتێکەڵاویی کوڕو کچ و گەنجانی وڵاتەکەمان گەنجانمان لەو شوێنانە دەستدەکەن بەنامەگۆڕینەوەو دروستکردنی پەیوەندی سۆزداری ناشەرعی.

هەر لەو ڕێگایەنەش باس و بەسەرهاتی مەترسیدار دروستبووە کە کۆتاییەکەی بەداوێنپیسی و وازهێنان کۆتایی پێهاتووە.

وە کەسانێک دێننە ناو بەرنامە ئەو کەسانە لایەنگرو بانگەشەکارن بۆ بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی پوچ و تێکدانی ڕەوشتی کۆمەڵگەی کوردی.

بەگۆرانی سۆزداری و قسە بێبنەماکانیان گەنجان مەست و پەلکێش دەکەن بۆ باوەشی مەبەستە ژەهراویەکانیان و تووشی سەدان نەخۆشی کوشندەی وەک لادانی ڕەوشتی و هەڵوەشاندنەوەی بیروباوەڕو بێئاگایی و چەندینیتر دەبەن.

## دووەم: چاوپێکەوتن:-

تیڤییەکان لەم ڕۆژەدا بەمایک و کامێراوە دەچنە کۆلێژو پەیمانگاکان و بەپرسیاری بێواتاو وورووژاندنی خۆشەویستی و شتی پوچ بەردەبنە گیانی کچ و کوڕەکانمان.

بۆچی دەچنە کۆلێژو پەیمانگاکان؟

چونکە لەکۆلێژو پەیمانگاکان کچ و کوڕان لەهەڕەتی گەنجیدان و حەزو ئارەزوویان بەرزەو کۆنترۆڵکردنی ئەو حەزو ئارەزووەش هێزێکی ئیمانی چاکی دەوێ تا بتوانی ناو ئەم هەموو تێکەڵییەو ئەم هەموو جەستە ڕووت و فیتنەیە خۆت بگری و دوور بیت لەتاوان و نەزەرو دواتر ئەنجامدانی زینا.

بەڵێ لەو ڕۆژەدا کۆلێژو پەیمانگاکان سوورپۆش دەکرێن و گۆرانی و میوزیکیش هەستەکان و بیروهۆشی لاوان کەمەندکێش دەکەن.

بەهۆی ئەم کارانەوە چەندین گەنج و لاوی پاک پیس بوون و ژیانیان بووەتە دۆزەخ بەتایبەت کچان، کە لەژێر ناوی خۆشەویستی و نیشاندانی خۆشەویستی تەنها بێڕەوشتی و



دۆزەخییان نیشاندەدەن و پیسیان دەکەن، بەم کارەش کچانمان ئازادی خۆیان لەدەستدەدەن و دەبنەی کۆیلەی کوڕان ئەویش لەترسی هەڕەشەی بڵاوکردنەوەی وێنەو ڤیدیۆکانیان .

## سێیەم: فیلمەکان:-

کەناڵەکان لەڕێگەی پەخش کردنی فیلمەکانەوە تایبەت فیلمە ڕۆمانسیەکان، ئەوانەی کە کچ و کوڕ تێیدا ڕۆڵی خۆشویستی و عەشق دەگێڕن و وەک پاڵەوانی فیلمەکان نیشاندەدرێن، ئەو جۆرە فیلمانە دێنن و دەرخواردی ئەم میللەتە بێسەرپەرشتەی دەدەن.

لەیەکێک لەفیلمەکان کە پەخش کرا، کچ و کوڕێک ڕۆڵیان تێدا دەگێڕا، دوای عاشق بوون و کێشەنانەوەی کۆمەڵایەتی زۆر بەڵام کچەکەیان بەکوڕەکە نەدا.

بۆیە کچەکە دەرمانێکی زۆر دەخوا تا شوو بەکەسیتر نەکات، دوای ئەوەی دەیبەنە نەخۆشخانە بەڵام دەرمان و دکتۆرەکان فریای ناکەون و دەمرێ .

کاتێ کوڕەکە بەمە دەزانێ ئەویش بڕیاری خۆکوشتن دەدات، بەڵام پێش ئەوەی گیانی دەربچێ و لەکاتی گیان کێشانا دەست درێژ دەکات بۆ ئەوەی دەستی بگیرێ و لەگەڵ خۆیان ببەن.

لەفیلمەکە وایان نیشاندەدا کە کچەکە لەلای ڕووبارێکی جوان و ناو باخ و سەوزاییەکی زۆر جوان بوو، مێزو کورسی دانابوو خواردنی خۆشی ئامادەکردبوو، چاوەڕێی کوڕەکەبوو تا بڕوات و لەو بەهەشتە بەیەکەوەو دوور لەخەڵکی ژیان بکەن.

کەناڵەکان بەپەخشکردنی ئەم جۆرە فیلمانە گەورەترین کارەسات دەخولقێنن لەبەر دوو هۆکار:

یەکەم: ڕەواج بەحەلاڵی پەیوەندی ناشەرعی دەدەن.

گومانی تێدا نییە ئەو پەیوەندیەی کە لەنێوان کچ و کوڕدا دروست دەبێت پێش هاوسەرگیری و خەڵکی ناویان ناوە خۆشەویستی حەرامە، هیچ کەسێکی عاقڵ گومانی لەوەدا نییە کە ئەم جۆرە پەیوەندیانە ڕێگەپێدراو نییە، چونکە کارەسات بەدوای خۆیدا دێنێت، وە ئەو خۆشەویستییە وا لەکچ و کوڕ دەکات قسەی سۆزداری بکەن و یەکتر ببینن و دەرچوون بەتەنهای لێبکەوێتەوە. ئەم جۆرە پەیوەندیەش بەداخەوە ڕووداوی



خراپی لێدەکەوێتەوەو کۆتایی چیرۆکەکان بەخراپتر لەوە کۆتایی دێ کەکچان بیری لێدەکەنەوە.

پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرموێ:- { لَا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ، وَلَا تُسَافِرُ امْرَأَةٌ إِلَّا وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ }[1].

واتە: با پیاو لەگەڵ ئافرەتێکی (بێگانەدا) بەتەنها نەمێنێتەوە (ئیللا مەگەر ئافرەتەکە کەسێکی مەحرەمی لەگەڵدا بێت)، وە با ئافرەت سەفەر نەکات ئیللا مەگەر مەحرەمێکی لەگەڵدا بێت.

بێگومان دەرچوونەکانی ئێستا مەگەر چۆن ئەگینا دەرباز بوون نییە بەبێ زینا جا بەهەرشێوەیەک بێ، گەر بەدەست گرتنێک بێ یا ماچ کردنێ یان هەر شێوازێکیتر .

موسڵمان دەبێ لەهەموو ئەو ڕێگەو ڕێچکانە خۆی بەدوور بگرێ کە نزیکی دەکەنەوە لەزیناو دواتر تووشبوون بەزینا، الله تعالی دەفەرموێ:- {وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَاۖ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا}[2].

---

[1] مسند احمد : حكم الحديث: إسناده صحيح على شرط الشيخين.
[2] - (٣٢) }الإسراء.




واتە: وە ئێوە نزیکی زینا مەکەونەوە، بەدڵنیایی ئەمە تاوانێکی بێزێنراوەو خراپترین ڕێگایە لەبەر ئەوەی بەرەو دۆزەختان ئەبات.

وە لەشوێنێکیتردا دەفەرموێ:-

(قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ)[1].

واتە: ئەی محمد ﷺ بڵێ: تەنها پەروەردگارم فاحیشەو بەدڕەوشتی و تاوانی حەرام کردووە ئەوەی بە ئاشکرا دەکرێ و ئەوەی کە بەنهێنی دەکرێ.

وە هەروەها پێغەمبەری خوداش ﷺ ئوممەتەکەی ئاگادار دەکاتەوە لەم کارە پیس و قیزەونەو دەفەرموێ:- {يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ، خَمْسٌ إِذَا ابْتُلِيتُمْ بِهِنَّ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ تُدْرِكُوهُنَّ : لَمْ تَظْهَرِ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ حَتَّى يُعْلِنُوا بِهَا إِلَّا فَشَا فِيهِمُ الطَّاعُونُ، وَالْأَوْجَاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلَافِهِمُ الَّذِينَ مَضَوْا... }[2]

واتە: ئەی کۆچەرییەکان پێنج شت هەن ئەگەر تووشی ببن (پەنادەگرم بەخوا کە تووشی ببن) هەرکاتێک داوێنپیسی

---

[1] - (٣٣) الاعراف

[2] - ابن ماجه



لەهەرگەلێکدا دەرکەوێت و بەئاشکرا ئەنجامی بدەن ئیلا تاعون و دەردو نەخۆشی سامناکی وا تیایاندا بڵاودەبێتەوە کە لەپێش ئەواندا لەباوک و باپیرانیان دەرنەکەوتووە.

بەڵێ ڕاستت کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێستا ئەوانەی ئەو جۆرە کارانە ئەنجام دەدەن دەردو نەخۆشی وایان تووشبووە کە پێشتر شتی وا نەبووە .

ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەو کەسانەی کە داوێنپیسی ئەنجامدەدەن و ئیمان لەلاشەیان نامێنێ دەفەرمووێ:- (لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ شَارِبُهَا حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ.)[1]

واتە: کەسێ داوێنپیسی بکات وە ئەوەی مەی بخواتەوەو ئەوەی دزی بکات لەو ساتەدا کە ئەنجامیدەدا هیچ ئیمان و بڕوایەک لەناو لاشەی نامێنێت[2].

---

[1] - سنن النسائي

[2] - لەکاتی ئەنجامدانی ئەو تاوانانە ئیمان لەلاشەی دێتەدەرەوە و بەسەریەوە دەوەستێ تا لەئەنجامدانی ئەو تاوانە دەست هەڵدەگرێ،کە دەستی هەڵگرت ئیمان دەچێتەوە ناو لاشەی .





کەواتە مرۆڤ دەبێ خاوەن شەرم و حەیا و خاوەنی ئیمان و باوەڕ بێ بۆ ئەوەی سوودمەندبن لەبەهەشتەکەی پەروەردگارو خۆ دوورگربێ لەو تاوانە پیسانەی کە ئیمان لەجەستەدا ناهێڵن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەوانەی خاوەن شەرم و خاوەن ئیمانن دەفەرموێ:- (الْحَيَاءُ مِنَ الْإِيمَانِ، وَالْإِيمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَالْبَذَاءُ مِنَ الْجَفَاءِ، وَالْجَفَاءُ فِي النَّارِ )[1] واتە: شەرم و حەیا بەشێکە لە باوەڕ، باوەڕیش لەبەهەشتدایە، قێزەونیش (قسەو کرداری بێواتاو قێزەوەن)بەشێکە لەبێباکی و بێباکیش لەدۆزەخدایە.

دووەم: ڕەواج بەخۆکوشتن دەدەن و وا لەبینەر دەکەن کە خۆکوشتن وەک چارەسەر بزانن، لەکاتێکدا خۆکوشتن حەرامەو سزای زۆر توندی لەسەرە لەدواڕۆژ .

خۆکوشتن لەئیسلام کارێکی حەرامکراوە، جا ئەو خۆکوشتنە بەهۆی خەم بێ یان بەهۆی کێشەوە یان

[1] - ابن ماجه



هەرکارێکیتر، مرۆڤ نابێ دەستی بچێتە گیانی خۆی چونکە لەڕۆژی دواییدا هەڕەشەی سزای بەئێشی لەسەرە .

الله تعالی دەفەرموێ :- (وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ )[1].واتە :- خۆشتان بەدەستی خۆتان بەفەتەرات مەدەن.

هەروەها دەفەرمووێت:- (وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمًا)[2]. واتە: خۆتان مەکوژن و (یەکتر بەناحەق مەکوژن، کاتێک بێزاریی و بێتاقەتی ڕووتان تێدەکات یان تووشی زیانێک دەبن)، بەڕاستی خوا میهرەبانە پێتان.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:- هەر کەسێک خۆی لەشاخێک یان بەرزاییەک فڕێبدات -بەمەبەستی خۆکوشتن- خۆی بکوژێت ئەو کەسە بەردەوام لە دۆزەخ خۆی فڕێدەدات تاهەتایە بەهەمیشەیی، وە هەرکەسێک ژەهر بخواتەوە بەم هۆیەوە خۆی بکوژێ لەدۆزەخ هەمیشە ژەهری لەدەستەو دەیخواتەوە، وە کەسێک بەشمشێر یان خەنجەرێک خۆی

---

[1] [سورة البقرة ١٩٥]
[2] - (النساء:٢٩)





**بکوژێت هەمیشە شمشێر یان خەنجەرەکەی لەنێو ئاگری دۆزەخ لەدەستدایەو خۆی پێدەکوژێت تاهەتایە.**

کەواتە ئێمە دەبێ بزانین خۆکوشتن هیچ کات چارەسەر نییە بۆ هیچ کارێک، بەڵکو باشترین شت ئەوەیە ئارامبگرین لەسەر ناخۆشی و هەڵەکانمان خوداش بەسۆزو بەرەحمە .

خۆکوشتن خراپترین بژاردەی نەفامەکانەو
هیچ شتێک چارەسەر ناکات



# ڤاڵانتاین لەڕوانگەی ئیسلامەوە

ئوممەتی ئیسلامی تایبەتمەندیی و تێڕوانین و بۆچوون و داب و نەریت و بەهاو کەلتوری تایبەت بەخۆی هەیە، کە هەڵقوڵاوی سەرچاوەی کانیاوی سازگاری قورئان و فەرموودەیە.

بەڵام لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەهۆی پەیوەندی و تێکەڵبوونی شارستانیەتیەکان بەیەکدی و کرانەوەی ڕاگەیاندنەکان و ئاسانکاری زۆر لەتۆڕەکان شتگەلێکی سەیروسەمەرە هاتووەتە نێو وڵاتانی ئیسلامییەوە کە زادەو هەڵقوڵاوی وڵاتانی ئەورووپییە بەتایبەت نەسرانییەکان، زۆر جاریش ئەو شتانەی کە دێنە ناو کۆمەڵگا دوورن لەڕاستی و جگەلە ئەفسانەو خورافیات هیچیتر نین.

هەرشتێک کە لەڕێگەی تیڤی و تۆڕەکۆمەڵاتیەکان دێتە ناو کۆمەڵگە بەچکە عەلمانیەکان بەو پەڕی ڕازاوەییەوە دەیهێنن و بەپێی حەزو نەفسی خۆیان دەیرازێنەوەو چاوی ئەم میللەتەی پێدەبەستن.

ئەم میللەتە خوێندەواری نەخوێنەوارە بەئایین و ڕاستی(واقع)، بێ ئەوەی لەڕاستی و دروستی بکۆڵێتەوە بەکردار دەست بەجێبەجێکردنی دەکات و شوێن هەموو کەس دەکەوێت گەر ئەو کەسانە دوژمنی خوداش بن، بێئاگا لەوەی پەروەردگار دەفەرموێت:- { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُمْ مِنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ ۙ أَنْ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ إِنْ كُنْتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي ۚ تُسِرُّونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنْتُمْ ۚ وَمَنْ يَفْعَلْهُ مِنْكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ }[1]. واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بەدۆستی خۆتان دۆستایەتی خۆتانیان بۆ دەنێرن لەکاتێکدا دڵنیاشن ئەوان بێ باوەڕن بەو ئایینە ڕاستەی کە بۆتان هاتووە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و ئێوەش دەردەکەن (لە بەرئەوەی) کە باوەڕ دەهێنن بەخوای پەروەردگارتان جا ئەگەر دەرچوون لەوڵاتی خۆتان بۆ جەنگ کردن لەڕێی منەوە بۆ داواکردنی خۆشنوودی من (دۆستایەتی ئەوان مەکەن) ڕازو نهێنییان پێ دەڵێن بەدۆستایەتی

---

[1] سورة الممتحنة:١



لەکاتێکدا ئەوەی شاردتانەتەوەو ئەوەی ئاشکراتانکردووە من دەیزانم، و هەرکەسێک لەئێوە دۆستایەتیان بکات ئەوە بێگومان ڕێی ڕاستی ون کردووە.

(قورتوبی) دەڵێ: (من كثر تطلّعه على عورات المسلمين وينبه عليهم ويعرّف عدوهم بأخبارهم لم يكن بذلك كافرا إذا كان فعله لغرض دنيوى، وإعتقاده على ذلك سليم، كما فعل حاطب حين قصد بذلك إتخاذ اليد، ولم ينو الردة عن الدين)[1].

دیاردەی ڕۆژی بەناو خۆشەویستی تەنها وڵاتانی خۆرئاوای نەگرتەوە، بەڵكو تەشەنەیکردو خۆی هاویشتە نێو وڵاتانی ئیسلامیشەوە، کچان و کوڕانی موسڵمانیش گیرۆدەی ئەو داوەبوون و شوێن دوژمنانی ئیسلام و خودا کەوتن و لەگەڵ ئەوان دەستیان بەئاهەنگگێڕان و دەربڕینی خۆشەویستی کرد وەک ئەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام هیچ گرنگیەکی بەخۆشەویستی نەدابێ.

---

[1] بەرگی:٩/جزمی/١٨/ل٤٨.

موسڵمانان لەم سەردەمەدا بەشێکی کەمی نەبێ ئەگینا بەداخەوە بەشێکی زۆری بیروباوەڕیان تێکەڵ بەبیروباوەڕە چەوتەکانی جگەلە ئیسلام کردووەو ئەو بیروباوەڕەی کە پێویستە هەبێت لەدەستیانداوە، ئەمەش بەهۆی بەشداریکردن لەهەموو جەژن و یادەکانیان، لەکاتێکدا ئەم ڕۆژەو ئەم جەژنە هیچ پەیوەندیەکیان بەموسڵمانانەوە نییە، وە دروست نیە موسڵمان ئەو ڕۆژە بکاتە جەژنی خۆی و خۆشحاڵی دەرببڕێت، چونکە ئەو ڕۆژە پەیوەندییەکی بەهێزی بەبیروباوەڕی نەسرانییەکان و ڕۆمانیەکانەوە هەیە، وەک باسمان کرد، ئەوە پەیوەندی بەخۆیانەوە هەیە، وە ڕۆمانیەکان بەئارەزووی خۆیان خوایان بۆ خۆیان داناوە، وەک: خوای خۆشەویستی، خوای ڕووناکی و خوای تاریکی، خوای ڕووەک، خوای باران، خوای دەریاکان، خوای ڕووبارەکان...هتد.

ئێستا کە یادو جەژنێکی گاورەکان دەبێ موسڵمان و گاورو جولەکە لەیەکتر جیا ناکەیتەوە لەشێوەو ڕەنگ و جلوبەرگ و هەڵسوکەوتیان، کە هۆکاری ئەمانەش چەند بابەتێکە:



بابەتی یەکەم: نەبوونی بیروباوەڕێکی پتەوو بەهێزو جێگیر.

بابەتی دووەم: نەخوێندنەوە و هەوڵنەدان بۆ گەیشتن بەڕاستییەکان.

بابەتی سێیەم: تێنەگەیشتن لەژیان و پشوودرێژی، عاتیفەو شوێنکەوتن .

بابەتی یەکەم: نەبوونی بیروباوەڕێکی پتەوو بەهێزو جێگیر:-

بیروباوەڕێکی جێگیر و پاک بۆ هەرتاکێکی موسڵمان لەهەمووشتێک گرنگترو بەنرخترە، چونکە موسڵمان بەهۆی ئەو بیروباوەڕە پاکەیەوە دەچێتە بەهەشت و ڕزگاری دەبێ لەدۆزەخ، ئەگەرچی بەهۆی تاوانیشەوە ڕەوانەی دۆزەخ کرابێ بەڵام دواجار ئەو بیروباوەڕە پاکە دەربازی دەکات و دەیباتە ناو ئەو بەهەشتەی کە نازونیعمەتەکانی ناژمێردرێن و لەتوانای بیرکردنەوەی مرۆڤ بەدەرە.

مرۆڤ بۆ ئەوەی ببێتە خاوەن بیروباوەڕێکی پاک دەبێ تەنها دەست بەدینی اللەوە بگرێ و پشت لەهەموو ڕێچکەو ڕێبازێکی چەوت و دەستکرد بکات و شوێنیان نەکەوێ، چونکە لادان لەسەر ڕێگا ڕاستەکەی ئیسلام بەرەو ئەو ڕێچکانەی دەبەن کە شەیتانەکان لەسەری وەستاون و بانگی خەڵکی بۆ دەکەن و بێئاگایان دەکەن و دووریان دەخەنەوە لەئایین و ڕێگا پاک و ڕاستەکەی ئیسلام، وەک ئیمام ئەحمەد (ڕەحمەتی خودای لێبێت) لەموسنەدەکەیدا هێناویەتی:- { عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ، قَالَ : خَطَّ لَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطًّا، ثُمَّ قَالَ : " هَذَا سَبِيلُ اللَّهِ ". ثُمَّ خَطَّ خُطُوطًا عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ، ثُمَّ قَالَ : " هَذِهِ سُبُلٌ - قَالَ يَزِيدُ : مُتَفَرِّقَةٌ - عَلَى كُلِّ سَبِيلٍ مِنْهَا شَيْطَانٌ يَدْعُو إِلَيْهِ ". ثُمَّ قَرَأَ : " { وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ }[١] ".

عبداللەی کوڕی مەسعود (ڕەزای خودای لێبێت ) دەڵێت:

---

[١] مسند احمد ( ٤١٤٢ )حكم الحديث: إسناده حسن




لەخزمەتی پێغەمبەری خودا بووین ﷺ و هێڵێکی ڕاکێشا بەچیلکەدارێک و فەرمووی ئەمەیە ڕێگەی الله، پاشان چەند هێڵێکی بچووکی بەلای ڕاست و چەپی ڕاکێشا، پاشان فەرمووی: لەسەر هەرڕێچکەیەک لەم ڕێچکانە شەیتانێک بانگتان دەکات بۆی، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە :- { وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ }[1]

واتە:- [وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ] ئەمە ڕێگای ڕاستی منە کە ئایینی ئیسلامە، کە بریتیە لەقورئان و سوننەت بەتێگەیشتنی سەلەفی ئوممەت ئێوە شوێنی بکەون، وە یەکڕیزو یەککۆمەڵ بن و بەش بەش و پارچە پارچە مەبن [وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ] وە شوێن ڕێچکەو ڕێبازەکانی تر مەکەون لەجوولەکەو گاورو ئاگرپەرستان و سەرجەم دینە پووچەڵەکانیترو هەموو ئەهلی بیدەع و گومڕایی و هەواو ئارەزووەکان شوێن هیچی مەکەون، وشەی (صِرَاطِي) بەتاک هێنا چونکە ڕێگای ڕاستی خوا یەک ڕێگایەو حەق یەکەو فرە نییە، بەڵام وشەی (السُّبُلَ)ی بەکۆ هێنا چونکە ڕێچکەو ڕێبازەکانیتر زۆرو فرەن [فَتَفَرَّقَ بِكُمْ

[1] الانعآم ( ١٥٣)



عَنْ سَبِيلِهِ] لەبەر ئەوەی ئەمانە هەمووی تەفرەقەو جیاوازی دەخاتە نێوانتانەوەو لەتەنها ڕێگا ڕاستەکەی خوای گەورە لاتاندەدا [ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (١٥٣)] بەم شتە خوای گەورە ئامۆژگاری کردوون و وەسێتی بۆ کردوون و فەرمانی پێکردوون بەڵکو تەقوای خوای گەورە بکەن.

موسڵمان دەبێت ئاگادارو چاو کراوەبێت و بەهیچ شێوەیەک کارێک ئەنجام نەدا کە نەزانێ سەرەنجامی ئەو کارە چییەو کاریگەری لەسەر بیروباوەڕی چییە. مرۆڤ کاتێ درکی بەوەکرد کە بۆچی هاتووەتە دونیاو ئەرکی چییە بێگومان ڕێژینێکی ساف و پاکی دەبێ و ناکەوێتە ناو زەلکاوە پیسەکان و هیچ پڕوشکێکی لەزەلکاوەکان بەرناکەوێت. کاتێ لەقورئان وورد دەبینەوە دەبینین پەروەردگار بەشێوەکی سەرەکی بۆ دوو مەبەست دروستی کردووین، ئەوانیش پەرستن و بەندایەتی کردنی و هاوبەش بۆ دروست نەکردنێتی .

١- بۆ مەبەستی پەرستش و بەندایەتی بۆ کردن: الله لەقورئانی پیرۆز دەفەرموێ :- ( وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)[١].

واتە: من مرۆڤ و جنەکانم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە من بپەرستن.

لەم ئایەتە قورئانییە الله ﷻ پێمان دوفەرموێت کە کاری سەرەکی مرۆڤ بەتاک دانان و بەتاک پەرستنێتی دوور لەهەموو هاوەڵ و شرک پەیداکردنێک.

٢- هاوبەش (شرک): چەندین ئایەتی قورئانی هەن ئاماژە بەترسناکی هاوەڵ بڕیاردان دەکەن بۆ خودای مەزن، بۆیە پێویستە مرۆڤ خۆی بپارێزێ لەهەررێچکەو ڕێبازێک کە یاسا دابنێ لەسەر یاسای خودا، یاسای خودا سڕ بکرێ و یاسای دەستکرد چالاک بکرێ و گرنگی پێبدرێ و موسڵمانیش پێی ڕازی بێت و یاساکانیان جێبەجێ بکات و چاوەڕوانی بەهەشتیش بکات لەقیامەتدا. نەخێر خودای مەزن هیچ کردەوەو پەرستشێک وەرناگرێ کە ئاوێتەببێ لەگەڵ کوفرو

---

[١]- [الذاريات: ٥٦]



هاوبەشدانەران وە لەقیامەتیش سزای پڕ ئێش ئامادەکراوە بۆ ئەو جۆرە کەسانەو خودا ڕازی نابێ و ڕێگە بەیاسایتر نادا کە پێچەوانەی یاساکانی ئەو بێت، خودای مەزن دەفەرموێ:-

{أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ}[1].

واتە: ئاخۆ ئەوانە ڕێگەی خواناسین دەگرن، یان چەند هاوبەشێک بۆ خوا دادەنێن چەند یاساو بەرنامەیەکیان بۆ داهێنابن لەئایین کە بەهیچ شێوەیە خوا مۆڵەتی نەدابن، خۆ شتی وا نەبووە؟! ئەگەر بەڵێنی خوا نەبا بەدواخستنی سزا بۆ ڕۆژی قیامەت هەرزوو لەدونیادا بڕیاردرابوو لەنێوان ئەوان و ئیمانداره‌کانداو بێگومان بۆ ستەمکاران بەشیرک جەزرەبەو سزایەکی بە ئێش هەیە. زۆرن ئەو هۆکارانەی کە بیروباوەڕی مرۆڤی موسڵمان دەشێوێنن لەتێگەیشتن لەواتاو مەبەستی قورئان و سوننەت و دووری دەخەنەوەو دەیخەنە گێژاوێکی وا کە بەسانایی ناتوانێ حەق لەباطل جیابکاتەوە، بەجۆرێ مرۆڤی

[1] [سورة الشورى ٢١]



موسڵمان سەرگەردان دەکەن و دەیشێوێنن تا وای لێدەکەن بەدرێژایی تەمەنی لەناو تەمدا بەدوای سێبەری خۆیدا بگەڕێ .

## "مەگەر لەناو "تەم"دا هیچ سێبەرێک بەدی دەکرێ ؟"

وە هاتووە لە:- { عن جابر بن عبد الله -رضي الله عنهما- أن رسول الله -صلى الله عليه وسلم- قال: "مَنْ لَقِيَ الله لا يُشْرِك به شَيئا دخل الجنَّة، ومن لَقِيَه يُشرك به شيئا دخَل النار}[1]. واتە:- لەجابری کوڕی عبداللەوە -ڕەزای خوایان لێبێت- کە پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «ئەوەی بگاتەوە لای خوای گەورەو بەهیچ شێوەیەک هاوبەشی بۆ خوای گەورە بڕیار نەدابێت ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە، و ئەوەی بگاتەوە لای خوای گەورەو بەشێوەیەک لەشێوەکان هاوبەشی بۆ خوای گەورە بڕیار دابێت، ئەوا دەچێتە دۆزەخەوە.

---

[1] [صحيح.] - [رواه مسلم.]



پێغەمبەر -صلى الله علیه وسلم- باسی ئەوە دەکات لەم فەرموودەدا کە ئەو کەسەی بمرێت وهیچ هاوبەشێکی بۆ خوای گەورە بڕیار نەدابێت نە لە(ربوبییەت - پەروەردگارییەتیدا) و نە لە(ئولوهیەت - خودایەتیدا) و نە لە(ناو سیفەتەکانی خودا) ئەوا ئەم کەسە دەچێتە بەهەشتەوە دوای وەرگرتنی سزای تاوانەکانی، ئەگەر کەسەکە بمرێت لەسەر هاوبەش بڕیاردان بۆ خوای گەورە ئەوا دەچێتە دۆزەخەوە .

موسڵمان دەبێ بەباش و چاکی ئاگاداری هەموو ئەو هۆکارانە بێت کە پەلکێشی دەکەن بۆ گومڕایی و هاوبەشدانان بۆ خودای گەورە، چونکە بەڕاستی هاوبەشدانان بۆ خودای گەورە مەترسیدارترین کارە مرۆڤ ئەنجامی بدات.

وە هاتووە لە:- { عن عبد الله بن مسعود -رضي الله عنه- عن النبي -صلى الله عليه وسلم- أنه قال: "أكبر الكبائر: الإشراك بالله، والأمن من مَكْرِ الله، والقُنُوطُ من رحمة الله، واليَأْسُ من رَوْحِ الله}.[1]

[1] [إسناده صحيح.] - [رواه عبد الرزاق.]





واتە:- لەعبداللەی کوڕی مەسعودەوە -ڕەزای خوای لێبێت- کە پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: «گەورەترینی تاوانە گەورەکان: شیرک و هاوبەشدانان بۆ خوای گەورە، دڵنیابوونی دووربوون لەپیلان و سزای خوای گەورە، بێهیوا بوون لەڕەحمەتی خوای گەورە، بێئومێدی لەهاتنی هێوری و ئارامی لەلایەن خوای گەورەوە.

پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- لەم فەرموودەدا باسی هەندێک تاوان دەکات کە لەتاوانە گەورەکان دادەنرێن، ئەوانەش بریتین لە: هاوەڵ و شەریک بڕیاردان بۆ خوای گەورە، و بەم تاوانە دەستی پێکرد چونکە گەورەترینە، و بێهیواو بێڕەجا بوون لەخوای گەورە تاوانە چونکە گومانی خراپ بردنە بەخوای گەورەو نەزانین و جەهلە بەفراوانی ڕەحمەتی ئەو زاتە، هەروەها تاوانێکیتر بریتیە لەئەمینی و دڵنیابوون بەوەی کە تووشی سزای خوای گەورە نابێت سەرەڕای ئەنجامدانی تاوان و بوونی نیعمەتەکانی خوای گەورە بەسەریەوە هەتا خوای گەورە لەناکاوو لەغەفڵەتدا سزای دەدات، و مەبەست لەم فەرموودە ئەوە

نییە کە تەنها ئەمانە تاوانە گەورەکانن چونکە تاوانە گەورەکان زۆرن بەڵام مەبەست ئەوەیە کە ئەمانە کۆمەڵێکن لەگەورەترین تاوانەکان .

هەرکەسێک لەسەر تەوحید (یەک خوا پەرستی) بمرێت ئەوا بۆ هەتاهەتایە لەدۆزەخ نامێنێتەوەو چارەنووسی بۆ بەهەشتە، ئەوەی لەسەر شیرک و هاوبەشدانان بۆ خوای گەورە بمرێت دۆزەخی بۆ واجب دەبێت، نزیکی بەهەشت و دۆزەخ لەبەندەوە هیچ لەنێوان ئەوو ئەو دووانە نییە جگەلە مردن.

واجبە ترسان هەبێت لەشیرک، چونکە ڕزگاربوون لەدۆزەخ بەندە بەسەلامەتبوون لەشیرک.

ڕوونکردنەوەی واتای (لا إله إلا الله)؛ کە بریتیە لەوازهێنان لەشیرک و هاوبەشدانان بۆ خوای گەورەو بەتاکدانانی خوای گەورەیە لەپەرستن و حوکمکردن و ...تاد.

ئەوەی لێرە ئێمە پێویستە تیشکی بخەینەسەرو قسەی لەسەر بکەین چوار بابەتی گرنگە کە بەشێکی موسڵمانان لەهەرچوار

بابەتەکە تێکەوتوون و زانیاریان لەسەر نییە، وە ئەو چوار بابەتەش هەڵقوڵاوی باسەکەمانە کە باسی ڤاڵاتنەینە.

ئەو چوار بابەتەش بریتین لە:

١-خۆشویستن و شوێنکەوتنی بێباوەڕان و ڕق لێبوونەوە (الولاء والبراء) .

٢- دروستکردنی مزگەوت و بینا لەسەر گۆڕ .

٣- تەبەرووک (التبرك).

٤- قوربانیکردن بۆ جگەلە الله.

## ١- خۆشویستن و شوێنکەوتنی بێباوەڕان و ڕق لێبوونەوە (الولاء والبراء):-

خودای گەورە باوەڕدارانی خۆشدەوێت و بەدۆستی خۆی دایناون و خۆشی بەبێباوەڕان نایەو بەدوژمنی خۆی و باوەڕدارانی داناوە.



موسڵمانیش دەبێ باوەڕدارانیان خۆشبوێ و دۆستایەتیان بکات و ڕقی لەبێباوەڕان بێت و بەدۆست و کەسی نزیکی خۆی نەزانێ و لەپێناو خودا ڕقی لەبێباوەڕان بێ .

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت:- {أوثق عرى الـإمان الموالاة فـي الله، والمعاداة في الله، والحب في الله، والبغض في الله}[1].

واتە: پتەوترین گرێی باوەڕ موالات کردنە (لەگەڵبوون) لەپێناو خودا، وە موعادات کردنە (دوژمنایەتی) لەپێناو خودا، وە خۆشویستنە لەپێناو خوداو ڕق لێبوونەوەیە لەپێناو خودا .

وەک لە فەرموودەکەدا هاتووە (موالاة) لەگەڵ (معاداة) پێچەوانەی یەکترن وەک چۆن خۆشەویستی پێچەوانەی ڕقە.

موالاة: بریتیە لەسەرخستن و پشتگیریکردن و ڕازیبوون و شوێنکەوتن و گوێڕایەڵی و خۆشەویستی .

موسڵمان دەبێ موالاتی تەنها بۆ خوداو پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺو موسڵمانان هەبێ و دەبێ موسڵمانان بکاتە یارو یاوەری

---

[1]- رواه التبراني

خۆی و لەگەڵیان برایەتی بکات و پشتگیریان بکات و سەریان بخات، و لەسەریشی حەرامە کە کافرو بێبڕوایان بکاتە دۆست و خۆشەویستی خۆیان و موالاتی بۆیان هەبێ.

## دۆستایەتی و خۆبەریکردن (الوَلآءُ وَالبراء) واتای چییەو نیشانەکانیان چین ؟

**الوَلآءُ:** واتە دۆستایەتی و خۆشویستنی خواو خۆشویستنی ئەوانەیە کە خوا خۆشی دەوێت وەکو فریشتەکان و پیاوچاکان و دۆستایەتیان بکەیت.

**البراء:** واتە خۆبەریکردن و ڕق لێبوونی ئەوەی خوا ڕقی لێیەتی.

دۆستایەتی و دژایەتی لەپێناو خودای گەورە پەیوەندییەکی گەورەو مەزنیان هەیە بەبیروباوەڕی موسڵمانەوە، و شوێنەوارێکی وایان هەیە لەسەر ڕەوشتی موسڵمان کە نکۆڵی لێناکرێت، و لەبەر ئەوەی گەلانی موسڵمان نوێنەرایەتی تەنها ئوممەتێک دەکەن کە بریتییە لەئوممەتی ئیسلام پێویستە لەسەر تاکی موسڵمان (کە خشتێکە لە خشتەکانی ئەم ئوممەتە) ڕیزپەڕ نەبێت




و لەکۆمەڵی موسڵمانان دەرنەچێت، وە خۆشەویستی و دۆستایەتی و دڵسۆزی بۆ خودای گەورەو پاشان بۆ کۆمەڵی موسڵمانان هەبێت و دەبێ تەنیا خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ و باوەڕداران بکەنە دۆست، وەک خوای گەورە فەرموویەتی:- (إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ)[1]

واتە: پشتیوان و دۆستی ئێوە ئەی موسڵمانان هەرخواو پەیامبەرەکەیی و باوەڕدارانن (نەک جوولەکەو گاورو ئەڵقە لەگوێکانیان)، ئەوانیش ئەوانەن بەڕێکوپێکی نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و هەمیشەش دیاردەی کڕنوش و ملکەچی بۆ فەرمانەکانی خوایان پێوە دیارە.

وە دەبێ موسڵمان هەموو هەستەکانی پەیوەست بێت بە ئوممەتی ئیسلامەوە وەک پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:- «مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ كَمَثَلِ الْجَسَدِ

[1] [سورة المائدة ٥٥]



الواحد، إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى»[1] واتە: نمونەی ئیمانداران لەسۆزو ڕەحم و بەزەییدا بۆ یەکتر وەکو یەک لاشە وایە، ئەگەر یەک ئەندامی ئێش و ئازارێکی هەبێت هەموو ئەندامەکانی تریش ئازاریان دەبێت، بە تاو شەونخونی.

باوەڕ تەواو نابێت بەدۆستایەتی و دژایەتی لەپێناو خودا نەبێـت، وەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:- «مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ وَأَبْغَضَ لِلَّهِ وَأَعْطَى لِلَّهِ وَمَنَعَ لِلَّهِ فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ»[2] واتە: خۆشەویستیت لەپێناو خوا بێت و ڕق لێبونەوەت لەپێناو خوا بێت گوێڕایەڵیت بۆ خوا بێت وە خۆگرتنەوەشت بۆ خوا بێت ئینجا ئیمانت تەواو (کامل) دەبێ.

خۆشویستنی خودای گەورە کردەوەی دڵەو ئەوەش بنچینەو بنەڕەتی باوەڕە، بەکورتی باوەڕ دانامەزرێت تا دڵ خۆشەویستی خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ تێدا نەبێت.

---

[1] متفق عليه عن النعمان بن بشير واللفظ لمسلم.

[2] (رواه الامام أحمد وأبو داود والترمذي وهو في السلسلة الصحيحة للشيخ الألباني).




ئیبنوتەیمیە ڕەحمەتی خودای لێبێ دەربارەی گرنگی خۆشویستنی خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەڵێت:-

خۆشەویستی خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ لەگەورەترین پێویستیەکانی باوەڕەو لەگەورەترین بنچینەو بناغەکانیەتی، بەڵکو خۆشەویستی بنچینەی هەموو کردەوەیەکە لەکردەوەکانی باوەڕو ئایین، هەروەک چۆن گشت جوڵەیەک لەو بوونەوەرەدا لە خۆشەویستییەوە سەرچاوە دەگرێت، جا چ لەخۆشەویستییەکی ڕاست و دروست بێت چ لەڕووی خۆشەویستییەکی نادروست و ناپەسەند بێت .[1]

هەروەها زانای بەڕێز (ئیبن قەیمی جەوزی) ڕەحمەتی خودای لێبێ دەڵێت:- بنچینەو بناغەی بەندایەتی خۆشویستنی خودایەو خۆشویستن هەمووی لەپێناو خودا بێت، جا کەسی لەگەڵ خودا خۆشنەوێت بەڵکو لەپێناو خودا خۆشیبوێت، هەروەک چۆن پێغەمبەرەکانی و فریشتەکانی و دۆستەکانی خۆشدەوێت، کە خۆشەویستیمان بۆیان لەتەواوی خۆشویستنی خوداوەیە، نەک

[1] - مجموعة الفتاوى لإبن تيمية ( بەرگی ١٠ لاپەڕە ٣٢ )

خۆشویستن بێت لەگەڵی، وەک خۆشەویستی ئەوانەی جگەلە خودا شتیتر دەپەرستن کە وەک خودا خۆشیان دەوێت، جا ئەگەر خۆشویستنی خودا بریتی بێت لەڕاستی و نهێنی بەندایەتی ئەوە بێگومان بەندایەتی بەدیدێت و تەواو دەبێت بەشوێنکەوتنی فەرمانەکانی، وە دوورکەوتنەوە لەو شتانەی کە نەهی لێکردووە، بۆیە لەشوێنکەوتنی فەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە لەنەهییەکانی ڕاستێتی بەندایەتی و خۆشەویستی دەردەکەویت .[1]

بێگومان کاتێک خۆشەویستی الله لەدڵێکدا جێگیرو چەسپاو بێت و لەناخەوە بووبێتە شتێکی ڕاستەقینە ئەوە ئەوکاتە ئەو دڵە بەهیچ شێوەیەک خۆشەویستی کەسێک لەخۆ ناگرێت کە بێباوەڕ بێ بەئایینی ئیسلام و لوتبەرز بێ لەپەرستنی الله سبحانە وتعالی.

بۆیە بزانە ئەم دۆستایەتی و دژایەتیە بابەتێکی گرنگ و بنچینەیەکی مەزنە لەبنچینەکانی یەکتاپەرستی (التوحید) .

---

[1] - مدارج السالکین لإبن القیم الجوزي ( بەرگی ١ لاپەڕە ٩٧ )



## هەندێ سیفاتی باوەڕداران

_ (الولاء) دۆستایەتیکردن و خۆشویستنی ئیمانداران.

*ئەگەر موسڵمان لەوڵاتێک بژێت کە هی کافرو هاوبەش پەیداکەران بوو ئەوا پێویستە ئەو وڵاتە جێبهێڵێ و بۆ ئەو شوێنە کۆچ بکات کە موسڵمان تێیدا دەسەڵاتدارن و حوکمی خودای تێدایە[1].

*سەرخستنی موسڵمانان و یارمەتیدانیان بەماڵ و گیان و زمان لەهەرشتێک کە پێویستیان پێی دەبێت لەئایین و ژین.

پەروەردگار دەفەرموێ:-{وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ}[2]. واتە: ئیماندارانی پیاوو ئافرەت هەندێکیان دۆست و یارمەتیدەرو سەرخەری هەندێکی تریانن.

---

[1] - کۆچکردن: بریتیە لەگواستنەوە لەوڵاتی بێباوەڕانەوە بۆ وڵاتی موسڵمانان لەپێناوی (الله)و سەرخستنی ئایینەکەی .

[2] - [التوبة:٧١].



*ئازار پێگەیشتن بەئازار پێگەیشتنیان وخۆشحاڵبوون بەخۆشحاڵبوونیان و سۆزو بەزەیی بۆ یەكترو ببنە تەواوكەری یەكتر، وەك ئەندامەكانی لاشە بەیەكەوە پەیوەست بن، وەك چۆن شوێنێكی لاشە ئازاری پێدەگات هەموو لاشە هەستی پێدەكات، وەكو ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە پێشتریش باسمكرد:- «مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالْحُمَّى والسَّهَرَ» .[1]

*موسڵمان نابێت مامەڵە لەسەر مامەڵەی براكەیدا بكات و نابێت نرخ لەسەر نرخی ئەوان دابنێت، وە نابێت خوازبێنی لەسەر خوازبێنی براكەیدا بكات، وە نابێت ڕێگر بێت لەوەی كە ئەوان پێشی دەكەون لەشتە حەلاڵەكاندا.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:- «ألاَ لاَ يَبعْ الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ، وَلاَ يَخْطُبُ عَلَى خِطبَتِهِ» [2] واتە: با هیچ كەس مامەڵە

[1] - رواه البخاري

[2] رواه البخاري.



نەکات بەسەر مامەڵەی براکەیدا، و خوازبێنی نەکات بەسەر خوازبێنی براکەیدا.

*ڕاستگۆبوون و حەزی چاکە بەرامبەر یەکترو دەست هەڵگرتن لەفروفێڵ و یەکتر هەڵخەڵەتاندن، وە هەرشتێک بۆ خۆی پێی خۆشبێت بۆ براو دەوروبەرەکەشی پێی خۆش بێت تا ئیمانی هەرکەسێ تەواوتر بێت وەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:- «لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ» [1] واتە: کەستان ئیمانی نییە تاوەکو ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش نەبێت.

*سەردانی یەکترو بەرپاکردنی خۆشەویستی و دانیشتن لەگەڵ یەکتر، بەم کارەش خۆشەویستی پێغەمبەر بەدەست دەهێنن وەک سەرووەرمان ﷺ دەفەرموێ:- «وَجَبَتْ مَحَبَّتِي لِلْمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ».

واتە: خۆش‌ویستنی من پێویست و مسۆگەر بووە بۆ ئەوانەی لەپێناوی مندا سەردانی یەکتر دەکەن.

---

[1].أخرجه البخاري

*نواندنی سۆزو بەزەیی بەرامبەر یەکتر، بەزەیی هاتنەوە بەلاوازەکان وەک منداڵ و ڕێزگرتنی کەسانی بەتەمەن هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:- «لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يُوَقِّرْ كَبِيرَنَا، وَيَرْحَمْ صَغِيرَنَا»[1].

واتە: لەئێمە نییە ئەوەی ڕێز لەگەورەکانمان نەگرێ و بەگەورەیان ڕانەگرێ و بەزەیی بەبچوکەکانماندا نەیەتەوە.

*لەکەدارنەکردنی موسڵمانان و بەگەورە ڕاگرتنیان و بەکەم سەیرنەکردنیان.

*لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا لەکاتی دەوڵەمەندی و هەژاریدا براو پشتی یەکتربن، ئەوەش پێچەوانەی دووڕووەکانە کە تەنها لەخۆشی و دەوڵەمەندی لەگەڵ خەڵکین، لە کاتی تەنگانەو هەژاریدا پشت لەیەکتردەکەن .

*ڕێزگرتن لەمافەکانی یەکترو نەبەزاندنی سنووری یەکتر.

---

[1]- أخرجه الترمذي: كتاب: البر والصلة



* دوعاکردن بۆیان و داوای لێخۆشبوون کردن بۆ موسڵمانان بەگشتی وەک پەروەردگارمان دەفەرموێ:- { وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ }[1]. واتە: داوای لێخۆشبوون بۆ تاوانی خۆت و تاوانی ئیمانداارانی پیاوو ئافرەت بکە.

دووەم: (البراء) ڕق لێبوونەوەو دۆستایەتی نەکردنی بێباوەڕان.

لەسەر هەموو تاکێکی موسڵمان پێویستە خۆی بپارێزێ لەدۆستایەتیکردنی بێباوەڕان و خۆشویستنیان، چونکە دۆستایەی و خۆشویستنیان دەبێتە هۆی دەرچوونی ئەو کەسە لەبازنەی ئیسلام و دواتریش دژایەتیکردنی ئیسلام و موسڵمانان.

---

[1] - [محمد:١٩]





## پێویستە بزانین نیشانەکانی دۆستایەتیکردنی و خۆشویستنی بێباوەڕان چییە؟

یەکەم: بەشدارینەکردن لەجەژنەکانیاندا، یان یارمەتیدانیان لەسازکردنی ئاهەنگەکانیاندا، یان پیرۆزبایی لێکردنیان بەو بۆنەیەوە، یان ئامادەبوون لەو جۆرە بۆنەو ئاهەنگانە .

بەشداریکردن لەئاهەنگ و جەژنەکانیان و خۆ چواندن بەکافرو هاوبەشدانەران (موشریکان) بێگومان ئەمەش مەترسیدارە چونکە لەدونیاو دوارۆژ لەگەڵ ئەوان دەژمێردرێت وەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:- «مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ»[1].

واتە: هەرکەسێک خۆی بچوێنێت بەهەرکۆمەڵێکەوە ئەوا لەوانە، بەیەکێک لەوان دەژمێردرێت.

دووەم: نیشتەجێبوون لەوڵاتیان و کۆچ نەکردن لەترسی ئاینەکەی بۆ وڵاتی موسڵمانان:-

[1] أخرجه أبو داود ، وصححه الألباني رحمه الله.



خوای پەروەردگار عوزر لەوانەی لەوڵاتی کافران نیشتەجێ دەبن و کۆچ ناکەن قبوڵ ناکات، تەنها عوزر لەوانە قبوڵ دەکات کە لاوازو بێدەسەڵاتن و توانای کۆچکردنیان نییە، هەروەها ئەو کەسانەش عوزریان هەیە کە لەبەر بەرژەوەندییەکی ئایینی دەمێننەوە وەکو بانگەوازکردن بۆلای خوداو بڵاوکردنەوەی ئیسلام لەو وڵاتانەدا.

بەڵام گەر دەسەڵاتی هەبوو کۆچکردن بەم واتایەو بۆ ئەم مەبەستە ئەرکە لەسەر موسڵمان، لەبەرئەوەی مانەوەی لەوڵاتی بێباوەڕاندا بەبێ ئەو هۆیانەی کە باسمکرد نیشانەی دۆستایەتییەتی ئەو کەسەیە بۆ بێباوەڕان، هەر لەم سۆنگەیەوە خوای مەزن مانەوەی باوەڕداری لەنێو بێباوەڕان حەرامکردووە ئەگەر بتوانێت کۆچ بکات، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:-

{إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمْ الْمَلائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الآرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُوْلَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيراً، إِلآ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلا يَهْتَدُونَ سَبِيلاً ، فَأُوْلَئِكَ



عَسَى اللَّهُ أَنْ يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا } [1]. واتە: ئەوانەی فریشتەکان گیانیان دەکێشن لەکاتی سەرەمەرگدا کە ستەمیان لەخۆیان دەکردو کۆچیان نەدەکرد بۆ وڵاتی باوەڕداران فریشتەکان پێیان دەفەرموون: ئێوە لەکوێدا ژیانتان دەبردە سەر، بۆچی لەموشریکەکان جیا نەبونەوە، بەڵکو ژمارەی ئەوانتان زیادکرد، ئەوانیش لەوەڵامدا دەڵێن: ئێمە بێدەسەڵات بووین لەسەر زەویداو توانای کۆچکردنمان نەبوو، چونکە ڕاست ناکەن بۆیە فریشتەکان پێیان دەڵێن: ئایا زەوی خوا پان و فراوان نەبوو، تا کۆچبکەن؟ ئا ئەوانە شوێنی مانەوەیان دۆزەخە کە سەرەنجامێکی خراپە، تەنها ئەوانە نەبێت کە بەڕاستی بێدەسەڵاتن لەپیاوان و ئافرەتان و منداڵان کە هیچ چارەیان نییەو توانای کۆچکردنیان نییە، ئا ئەوانە ئومێد دەکرێت خوا لێیان خۆش ببێت و خوا هەمیشە لێبووردەو لێخۆشبووە.

---

[1] [ النساء:٩٧-٩٩.]

وە لەفەرموودەش هاتووە مانەوە لەوڵاتی کافران تایبەت لەکاتی شەڕدا لەنێوان موسڵمان و کافران گەر شەڕ بەرپا ببێ ئەوکات جیاوازی ناکرێت و دەست ناپارێزرێت لەکوشتنیان.

عن جرير بن عبد الله قال: بعث رسول الله -صلى الله عليه وسلم- سَرِيَّةً إلى خَثْعَمٍ فاعتَصَمَ نَاسٌ منهم بالسجود، فَأَسْرَعَ فيهم القَتْلُ قال: فَبَلَغَ ذلك النبيَّ -صلى الله عليه وسلم- فَأَمَرَ لهم بنصف العَقْلِ وقال: «أنا بريء من كل مسلم يُقيم بين أَظْهُرِ المشركين». قالوا: يا رسول الله لم؟ قال: «لا تَرَاءَى نَارَاهُما»[1].

واتە:- لەجەریری کوڕی عبداللهوە دەفەرموێت: پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- مەفرەزەیەکی نارد بۆ سەر هۆزی خەثعەم، خەڵکانێکیان خۆیان پاراست لەکوشتن ئەویش بەسوجدە بردن، بەڵام بەپەلە کوژران. دەڵێت: ئەم هەواڵە گەیشت بەپێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-و فەرمانی کرد بەپێدانی نیوەی پارەی خوێنەکەو فەرمووی: «من بەرپرسیار نیم و بەریم لەهەرمسوڵمانێک کە لەنێو موشریکەکاندا دەژێت». ووتیان:

[1] [صحيح.] - [رواه أبو داود والترمذي والنسائي.



بۆچی ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: چونکە هۆکاری ئاگرکردنەوەیان (جەنگ بەرپاکردنیان) جیاوازە. پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- مەفرەزەیەکی لەسوپا نارد بۆ سەر هۆزی خەثعەم چونکە کافر بوون و هەندێکیان سوجدەیان برد بۆ ئەوەی وا نیشانی بدەن کە موسڵمانن، بەڵام مسوڵمانان بەپەلە کوشتیانیان چونکە وا گومانیان برد کە موشریکن بەهۆی ئەوەی لەنێو موشریکەکاندا مابوونەوەو دەژیان، کاتێک دڵنیابوون لەوەی کە مسوڵمانبوون؛ پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- نیوەی پارەی خوێنەکەیانی (نیوەی پارەی دیەکەیانی) پێیانداو بەتەواوی پێیانی نەدا چونکە خۆیان هۆکاربوون بۆ ئەوەی بکوژرێن و شەریعەت مانەوەی لەوڵاتی کافران حەرامکردووە چونکە هۆکاری ئاگرکردنەوەی (جەنگ بەرپاکردنی) مسوڵمان و کافر جیاوازە واتە: (مسوڵمان بۆ ئیسلام تورە دەبێت و جەنگ دەکات -ئاگر دەکاتەوە-و کافریش بۆ کوفر تورە دەبێت و جەنگ دەکات -ئاگر دەکاتەوە-)، و نابێت شوێنی نیشتەجێبوونی بەو شێوەیە نزیک بێت لەکافرەکانەوە ئەگەر

ئاگرێک بکاتەوە کافرەکە دەیبینێت، ئەمیش نیشانەی بەریبوون و خۆ دوورکردنەوەیە لەکوفرو کافرەکان.

سێیەم: گەشتکردن بۆ وڵاتیان بەمەبەستی گەشت و گوزارو ڕابواردن نەک پێویستی:-

گەشتکردن بۆ وڵاتی بێباوەڕان حەرامە، مەگەر بۆ پێویستییەک، وەك: چارەسەرکردن و بازرگانی و فێربوونی زانست لەبوارە بەسودەکان کە ئەگەر بەگەشتکردن نەبێت بۆ ئەو وڵاتانە ئەو زانستە بەدەست نەیات، ئەوکاتە بەپێی پێویستی دروستە, کە پێویستی تەواو بوو ئەرکە بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی موسڵمانان.

بۆ دروستێتی ئەم گەشتەش مەرجە ئەو کەسەی کە گەشت دەکات, بەئاشکرا ئاسەواری دینداری پێوە دیاربێت و دینداری خۆی بکات و سەربەرز بێت بەئیسلامەتیەکەی، و لەشوێنە خراپەکان دوور بکەوێتەووە دەبێت ئاگاداری خۆی بێت لەپیلانگێڕی دوژمنان و فڕوفێڵیان، بەهەمان شێوە دروستە یان ئەرکە گەشت بکرێت بۆ وڵاتیان ئەگەر لەپێناو بانگەوازکردن و بڵاوکردنەوەی ئیسلام بوو. بەکورتی موسڵمان دەبێت ئەوەندە

زانستی پێ بێت بەرگەی شوبوهات و گومانی ئەوان بگرێت، و ئەوەندەی ئیماندارو دیندار بیت بەرگەی شەهەواتی ئەوان بگرێت.

## چوارەم: ڕەحمەت ناردن و داوای لێخۆشبوون بۆیان:-

ئەگەر ئەهلی کوفر زیندووبوون ئاساییە نزای هیدایەتیان بۆ بکرێ بەڵام نابێ ڕەحمەتیان بۆ بنێردرێ وەک ئەوەی بەکەسێکی کافرو دژی موسڵمانان بڵێیێ (ڕەحمەتت لێبێ بۆ ئەوکارە یان ئەو قسەیەی کە کردت) ئەمە دروست نییە بەهیچ شێوەیەک وە موسڵمان بۆی نییەو ڕێی پێنەدراوە تا نزا بۆ مردووانی ئەهلی کوفر بکات و ڕەحمەتیان بۆ بنێری.

وەک پەروەردگارمان دەفەرموێ:- {مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُوْلِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ} التوبة: ١١٣. واتە: بۆ پێغەمبەر ﷺ و ئیمانداران نییە داوای لێخۆشبوون بۆ موشریکەکان بکەن ئەگەرچی خزمی نزیکیشیان بێت، دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن.



## پێنجەم: لاساییکردن و خۆ چواندن پێیان لەجلوبەرگ و هەڵسوکەوت و قسەکردندا:-

خۆ چواندن پێیان لەجلوبەرگ و قسەکردن و هەڵسوکەوت و جگەلە ئەمانەش بەڵگەن لەسەر خۆشویستن و لاساییکردنەوەی ئەوان، لاساییکردنەوەو خۆ چواندن بەئەهلی کوفر مەترسیدارە چونکە بەیەکێ لەئەوان دەژمێردرێن وەکو ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە پێشتریش باسمکرد:- «مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ» [1]. لەژێر ڕۆشنایی ئەم فەرموودەیەدا لاساییکردنەوەو خۆ چواندن بەبێباوەڕانەوە لەشتانێکدا کە تایبەتە بەخۆیان، لەدابونەریتیان و پەرستشیان، سەروسیماو ئاکاریان، وەکو: ڕیش تاشین یان درێژکردن و هێشتنەوەی سمێڵ یان قسەکردن بەزمانیان مەگەر بۆ پێویستی، هەروەها خۆ چواندن لەشێوازی جلوبەرگ و خواردن و خواردنەوە...تاد.

---

[1]- أخرجه أبو داود ، وصححه الألباني رحمه الله.

شەشەم: داوای یارمەتیکردن لێیان و متمانەکردن پێیان، و کردنیان بەکاربەدەست و ڕاوێژکار، ئەمڕۆ دەبینین موسڵمانان لەجیاتی کەسی شیاو کەسانی بێئایین و دژەئایین دەکەنە کاربەدەست و گەورەی خۆیان لەکاتێکدان ڕەنگە ئەو کەسانە زۆر لەوە بچووکتربن کە بکرێنە گەورەی ماڵێکیش نەک کاربەدەست و گەورەی میللەتێک.

حەفتەم: سەرسامبوون بەو شارستانیەت و لێهاتوویەی ئەوان، بەبێ حیسابکردن بۆ بیروباوەڕە پوچەکەیان و دینە دەستکردە خراپەکەیان:-

پەروەردگار دەفەرموێ:- { وَلاَ تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَى }[1] واتە: تۆ چاو مەبڕە ئەو کەسانەی کە ژیانی دونیامان پێبەخشیون لەڕازاوەیی ژیانی دونیا لە خێزان و جوانی و ماڵ و منداڵ و دەسەڵات ئەمە هەمووی تاقیکردنەوەی خوای گەورەیە بۆ ئەوان، بەهۆی ئەوانەوە تاقیان دەکەینەوەو پاشان نامێنێت و

[1] [طه:١٣١.]



لەناو دەچێت، بەڵام ئەو ڕزقەی کە خوای گەورە لەبەهەشتدا پێتدەبەخشێت و پاداشتت دەداتەوە ئەوە باشترەو زیاتریش دەمێنێتەوەو بۆ هەمیشەیە.

لەم ئایەتەوە فێردەبین هەرکاتێ نەفس پەلکێشی کردین بۆ جوانییەکانی دونیا، پێویستە بەبێ دواکەوتن بیر لەکۆتاییەکەمان بکەینەوە، بیر لەقیامەتمان بکەینەوەو یادی پەروەردگار بکەین و نازونیعمەتە هەمیشەییەکانی پەروەردگار بەشتێکی کەمی کاتی دونیا نەفرۆشین.

هەشتەم: ناونانی منداڵ بەناوی ئەوان:-

موسڵمان نابێ ناوی منداڵەکانی بەناوی ئەوان بنێ، بەڵکو دەبێ ناوی ئایینی یان ناوی پڕواتا هەڵبژێرێ بۆ ناونانی منداڵەکانی. کاتێ کە ناوی منداڵەکان وەکو ناوی ئەوان بوو، ئاکارو جلوبەرگیان و نوێژ نەکردنیان وەکو ئەوان بوو ئەی موسڵمانێتییەکەی ئەم میللەتە لەکوێدایە؟؟

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: «خَيْرُ الأَسْمَاءِ: عَبْدُ اللَّهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ»[1]. واتە: باشترینی ناوەکان و خۆشەویسترین ناوەکان لای پەروەردگار (عبدالله و عبدالرحمن ) ە.

نۆیەم: یارمەتیدانیان و سەرخستنیان بەسەر موسڵماناندا.

ئەمەیان زۆر مەترسیدارە چونکە سەرخستنیان بەسەر موسڵماناندا دەبێتە هۆی ژێردەستەکردنی ڕەوشت و بنەچەی موسڵمانان و بێهێزکردن و بێدەسەڵاتکردنی موسڵمانان بەرامبەر ئەهلی کوفر، بەمەش موسڵمانان ناتوانن حوکمی اللەو فەرمانەکانی اللە لەسەر زەوی جێبەجێ بکەن و لەشوێنی قورئانی پیرۆز ئایینە دەستکردەکانی زەوی حوکم دەکەن و قورئانی پیرۆز دەبێتە کتێبێکی سادە و ئاسایی، یان ستایشکردنیان و بەشانوباڵدا هەڵگوتن و بەرگری لێکردنیان، بێگومان ئەمانەش یەکێکن لەهەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام و لەهۆکارەکانی هەڵگەڕانەوەیە لەئایین، پەنا بەخوا لەم جۆرە کردارانە، سەرخستنیان بەسەر موسڵماناندا بەکۆدەنگی زانایان کوفرە،

[1] مسند احمد : حديث صحيح



یارمەتیدانیان و ستایشکردنیان و بەرگریکردن لێیان هەموو ئەمانەش نیشانەی ڕازیبوونە بەوەی ئەوان لەسەرین لەکوفرو بێدینی و یاسا دەستکردەکان.

کەواتە ئاگاداربە ئەنجامدانی ئەو کارە جگەلە ئەوەی سەرپێچی پەروەردگاری تێدایە واتای تریش هەڵدەگرێ یەکێکیش لەو واتایانە ئەوەیە کاتێ تۆ ئەم کارە دەکەی واتای وایە تۆ خۆشت دەوێن و ئەو بەرنامەو دەستوورە پیسەی کە پەیڕەوی دەکەن بەڕاستی دەزانی بۆیە ئەو کارە ئەنجامدەدەی، موسڵمانان دەبێ وریا بن و زانابن پێش ئەنجامدانی هەرکارێک کە بیانەوێ ئەنجامی بدەن، پێش ئەوەی تووشی کوفرو شرک بن، خودای گەورە پەنامان بدا .

## خەڵکی لەدۆستایەتی و ڕق لێبووندا دەبنە سێ بەش

یەکەم: ئەوانەن کە خۆشدەویسترێن بەپاک و پوختانە، کە هیچ ڕق و دژایەتیەکی تێدا نییە، بریتین: لەباوەڕدارە دڵسۆزەکان (موخلیصەکان)، لەپێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان، لەپێش هەمووشیان پێغەمبەری خوایە ﷺ کە دەبێت خۆشویستنی زیاتر بێ لەنەفس و منداڵ ودایک و باوک و هەموو خەڵکی.

دووەم: ئەوانەن کە دەبوغزێندرێن و دژایەتی دەکرێن، کە هیچ خۆشویستن و دۆستایەتییەکی تێدا نییە، ئەمەشیان کافرن کە بێباوەڕان و هاوبەش پەیداکەران و دووڕوان و هەڵگەڕاوان و بێئایینەکان بە سەرجەم ڕەگەزەکانیانەوە دەگرێتەوە.

سێیەم: ئەوانەن کە لەڕوویەکەوە خۆشدەویسترێن و لەڕوویەکەوە ڕق بەرامبەریان هەڵدەگیرێ . ئەمەشیان تاوانبارانی ئیماندارانن، لەم کەسانەدا خۆشویستن و ڕق لێبونەوە کۆدەبێتەوە،

خۆشدەویسترێن بەهۆی ئەو ئیمانەی هەیانە، وە دەبوغزێندرێن بەهۆی ئەو سەرپێچیانەی هەیانە کە ناگەنە ئاستی کوفرو شیرک. خۆشویستنیشیان ئەوەیە کە ئامۆژگاری بکرێن و نکۆڵیان لێبکریێ، بۆیە نابێت بێدەنگ بین لەئاست سەرپێچیەکانیان، پێشیان لێدەگیریێ لەسەرپێچی و فەرمانیان پێدەکرێت بەچاکەو نەهییان لێدەکرێت لەخراپە.[1]

---

[1] سود وەرگیراوە لەکتێبی (الوَلاَءُ وَالبرَاء فِي الإِسْلاَم) لەنوسینی: الشیخ صالح بن فوزان الفوزان .



## ٢- دروستكردنی مزگەوت و بینا لەسەر گۆڕ:-

دروست نییە لەسەر گۆڕ مزگەوت دروست بكرێ، وە ئەگەر گۆڕ كۆنبوو بینای لەسەر دروست كرابوو ئەركە ئەو بینایە بڕوخێنرێت، جا قوبە بێت یان جگەلە ئەوە دەبێت لاببرێت، وە دروست نییە چونكە ئەوە هۆكاری (شیرک)ە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لَعَنَ اللَّهُ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى؛ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ)[1]. واتە: خودای گەورە نەفرەتی كرد لەجولەكەو گاورەكان چونكە گۆڕی پێغەمبەرەكانیان دەكردە مزگەوت.

وە هەندێ لەخێزانەكان بە پێغەمبەرﷺیان فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە كڵێسایەكمان بینی لەوڵاتی حەبەشە وێنەی تێدابوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (أُولَئِكِ قَوْمٌ إِذَا مَاتَ فِيهِمُ الْعَبْدُ الصَّالِحُ أَوِ الرَّجُلُ الصَّالِحُ، بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكِ الصُّوَرَ، أُولَئِكِ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ )[2].

---

[1]- صحيح البخاري | كِتَابٌ : الْجَنَائِزُ | بَابُ مَا جَاءَ فِي قَبْرِ النَّبِيِّ ﷺ ، وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا.

[2]- صحيح البخاري | كِتَابٌ : الصَّلَاةُ | بَابُ الصَّلَاةِ فِي الْبِيعَةِ.



ئەوانە ئەگەر پیاوچاکێک بمردایە لەناویاندا لەسەر گۆڕەکەی مزگەوتیان دروستدەکردو ئەو وێنانەیان تێدا دروستدەکرد، ئەوانە خراپترین دروستکراوی خودای گەورەن. پێغەمبەر ﷺ ئاگادارمانی کردووەتەوە کە خراپترین دروستکراوی خوای گەورەن چونکە بینایان لەسەر گۆڕستان دروستدەکردو دەیانکردە مزگەوت و وێنەیان تێدا دروستدەکرد،وە دیسانەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( لَا تُصَلُّوا إِلَى الْقُبُورِ، وَلَا تَجْلِسُوا عَلَيْهَا)[1]. واتە:- بەرەو ڕووی گۆڕستان نوێژ مەکەن و لەسەریشی دامەنیشن.

هەروەها لەفەرموودەیەکیتردا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُجَصَّصَ الْقَبْرُ، وَأَنْ يُقْعَدَ عَلَيْهِ، وَأَنْ يُبْنَى عَلَيْهِ)[2]. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە کە قەبر گەچکاری بکرێت و لەسەری دابنیشرێت و بینای لەسەر دروست بکرێت.

لەئەبی هورەیرەوە -ڕەزای خوای لێبێت- فەرمویەتی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {اللهم لا تجعل قبري وثنا يُعبد، اشتد غضب الله

---

[1]- صحيح مسلم | كِتَابٌ : الْجَنَائِزُ. | بَابٌ : النَّهْيُ عَنِ الْجُلُوسِ عَلَى الْقَبْرِ، وَالصَّلَاةِ عَلَيْهِ.
[2]- صحيح مسلم | كِتَابٌ : الْجَنَائِزُ. | بَابٌ : النَّهْيُ عَنْ تَجْصِيصِ الْقَبْرِ وَالْبِنَاءِ عَلَيْهِ.



على قوم اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد}[1]. لەئەبی هورەیرەوە - ڕەزای خوای لێبێت- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: خودایە گۆڕەکەم نەکرێت بەبتێک کە بپەرسترێت، تورەبوونی خوای گەورە زیاتربوو لەسەر گەلانێک کە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کرد بەمزگەوت».

پێغەمبەر ﷺ ترسا لەوەی کە ئومەتەکەی بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ گۆڕەکەی بکەن هەروەکو چۆن جولەکەو نەسڕانییەکان مامەڵەیان لەگەڵ گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردووە کە ئەو مامەڵە زیادەڕۆیانە سەری کێشا بۆ ئەوەی ئەو گۆڕانە ببنە بت و بپەرسترێن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پاڕایەوە لەپەروەردگاری بۆ ئەوەی گۆڕەکەی وەکو گۆڕی پێغەمبەرەکانیتری لێ نەیەت، پاشان پێغەمبەر ﷺ هۆکاری تورەیی و نەفرەتی سەر جولەکەو نەسڕانییەکانی ڕوونکردەوە، چونکە بەهۆی ئەو زیادەڕۆیکردنەبوو لەمافی گۆڕەکانی پێغەمبەران هەتا وایان

[1] [صحيحان.] – [حديث عطاء بن يسار: رواه مالك. حديث أبي هريرة رضي الله عنه: رواه أحمد.]



لێکردن کە ببنە بت و بپەرسترێن، بۆیە تووشی شیرکی گەورە بوون کە پێچەوانەی تەوحیدە (یەکخوا پەرستیی).

کەواتە:

١_زیادەڕەویکردن لەگۆڕی پیاوچاکان دەبێتە هۆی ئەوەی کە ببن بەبت و بپەرسترێن.

٢- لەزیادەڕەویکردن لەگۆڕەکاندا ئەوەیە کە بکرێنە مزگەوت، و ئەمەیش دەبێتە هۆی تووشبون بەشیرک.

٣-دڵنیابوون لەبوونی سیفەتی (تورەیی) بۆ خوای گەورە بەو شێوەیەی کە شایەنی شکۆداری خۆیەتی.

٤- سەردانیکردنی گۆڕەکان بەمەبەست و نیازی بەگەورەدانانی ئەوا دەبێتە پەرستنیان، وە ئەم کارە شیرکە ئەگەر خاوەن گۆڕەکەیش (مردووەکە) هەرچەندێک نزیک بێت لەخوای گەورەوە.

٥- حەرامبوونی دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕەکان.



٦- حەرامبوونی نوێژکردن لەلای گۆڕەکان ئەگەر مزگەوتیشی لەسەر دروستکرابیت یان نا.



## ٣- تەبەرووک (التبرك) چییە ؟

لەباسی ڤالآنتاین لەیەکێک لەسەرچاوەکان باسی لەوە دەکرد کە خەڵکی تەبەرووکیان بەگۆڕی ڤالآنتاین دەکردو بەپیرۆز سەیریان دەکرد، لێرەدا بەکورتی تیشکێک دەخەینە سەر بابەتی تەبەرووک لەڕوانگەی ئیسلامەوە:

لەزمانەوانیدا: هو زيادة الخير ونمائه.

واتە:- ئەوەیە کەوا ئەو خێرەی هەیە زیادی دەکات و گەشەی پێدەکات.

لەشەرعدا: دوو جۆرە (التبرك المشروع، التبرك الممنوع) .

التبرك المشروع: ئەوەیە کە شەرع ڕێی پێداوە تەبەرووکی پێوە بکەی.

یەکەم: لە کەسەکان؛ تەنها تەبەرووک بەزاتی پێغەمبەری خواوە ﷺ بەئاوی دەستنوێژی و بەتاڵە مووی پیرۆزی، بەجلەکانی، هەرشتێک کە پەیوەست بێت پێوەی.

دووەم: لەشوێن؛ تەبەرووک بەمزگەوتەکان، ئەوەش وەک شوێنی پەرستن و خوێندن، نەک پیرۆزی دیوارو زەویەکەی و کەلوپەلەکانی ناوی، وە ڕوکنی یەمانی، حجر، بێ ئەوەی بیروباوەڕی وابێت کە سوودو زیانیان بەدەستە.

سێیەم: لەکاتەکان: مانگی ڕەمەزان، لیال عشر(شەوانی قەدر)، عاشورا، تەبەرووک دەکەی بەڕۆژوگرتن تێیانداو لەڕەمەزاندا خوای گەورە جنە یاخییەکان کۆت و زنجیر دەکات .

چوارەم: لەخواردنەوە؛ ئاوی زەمزەم پیرۆزە، ئاوی باران.

پێنجەم: لەخواردن؛ وەک ڕەشکە، ڕۆنی زەیتون، هەنگوین.

التبرك الممنوع: ئەوەیە داوای بەرەکەت بکەی لەشتانێک کە لەشەرعدا ڕێی پێنەدراوە تەبەرووکی پێوە بکرێ: وەک دارو بەردو گۆڕ و... تاد .ئەوانە هەمووی کوفرە.

وە التبرك الممنوع دەبێتە دوو جۆر:



یەکەم/ شرکی گەورە: ئەمە پێی کافر دەبێت کاتێ مرۆڤ بیروباوەڕی وابێت خودی ئەم شتەی کە تەبەڕوکی پێدەکات شتی بەدەستەو توانای هەیە بۆ گۆڕان و بەرەکەت و باشکردن و خراپکردنی ژیان... هتد.

قال تعالى: ﴿ أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّىٰ(١٩) وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَىٰ(٢٠) أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَىٰ (٢١) تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰ (٢٢)﴾ [1].

پاش باسکردنی ئەو هەموو شتانەی کە پەیامبەر ﷺ چاوپێکەوت لەمیعراجدا، ئینجا بەهاوبەش پەیداکەرەکان دەفەرموێت: دەی پێم بڵێن ئایا لات و عوززا کە دوو بتن ❁ وە بتی سێ یەم کە مەناتە ئایا هیچیان پێ دەکرێ ❁ ئایا ڕاستە ئێوە کوڕتان ببێ و خوا کچ ؟.❁ئەگەر وابێ دابەش کردنێکی نادروست دەبێ.

اللاَّتَ: گەورەترین پەرستراوی قورەیش بوو پەرستراوی بنو ثقیف بوو.

---

[1] - سورة النجم ١٩ - ٢٢]



هاوەڵی بەڕێز مغیری کوڕی شعبە (خوا لێی ڕازی بێت) بەفەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووخاندی.

الْعُزَّى: بتی هۆزی قورەیش بوو، خالیدی کوڕی وەلید خوا لێی ڕازی بێت، لەناویبرد، العزی دارێک بوو دەیانپەرست.

مَنَاةَ: وەثەنێکی بنو هلال بوو، علي کوڕی ابو طالب ڕووخاندی، ئەمەشیان بت بوو.

(وثن) واتە: هەر شتێک جگە لە خوا بپەرسترێت.

عن أبي واقد الليثي قال: "خرجنا مع رسول الله ﷺ إلى حنين ونحن حدثاء عهد بكفر، وللمشركين سدرة يعكفون عندها وينوطون بها أسلحتهم يقال لها ذات أنواط. فمررنا بسدرة، فقلنا: يا رسول الله، اجعل لنا ذات أنواط كما لهم ذات أنواط، فقال رسول الله ﷺ: الله أكبر، إنها السنن. قلتم والذي نفسي بيده كما قالت بنو إسرائيل لموسى: اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ [الأعراف ١٣٨]،[1] واتە: (ئەبوو واقیدی

---

[1]- لتركبن سنن من كان قبلكم" رواه الترمذي وصححه.





لەیثیی) دەڵێت: هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەرەو (حونەین) دەرچوون، و کافرەکان دارێکی تایبەتی خۆیانیان هەیەو دەچنە بنی و شیعرو هۆنراوە دەڵێن و ڕم و کەوانەکانیشیانی لێهەڵدەواسن و بەو کارەیان پیرۆزی دەکەن پێی دەوترا ذات أنواط (واتا ئەو شتەی شتیتری پێوە هەڵدەواسرێت)، بەتەنیشت دارێکی نەبووکدا تێپەڕبووین و وتمان یا رسول الله شتێکمان بۆ دروست بکە شتی پێوە هەڵبواسین هەروەک چۆن ئەوان هەیانە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الله أکبر)! ئەمە هەر لەو قسەیە دەچێ کە هۆزەکەی موسا داوایان لەموسا کردو گوتیان: (اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ)[1]، واتە: ئەی موسا خودامان بۆ دروست بکە وەک ئەوەی کافرەکان خودایان هەیە، موساش فەرمووی: بەڕاستی ئێوە گەلێکی نەفامن.

لێرەدا هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت مەبەستیان شرک نەبوو، یان مەبەستیان سەرپێچیکردنی پێغەمبەری خوا نەبوو ﷺ بەڵکو بەهۆی نەزانینەوە ئەو داوایەیان پێشکەش بەپێغەمبەری خوا ﷺ

---

[1] الأعراف ١٣٨




کرد تا کارێکی لەو جۆرەیان بۆ بکات، ئەم داوایەش لەبەر ئەوەبوو تازە موسڵمان ببوون و کاریگەری شرک و کوفر لەناو بەشێکیان مابوو، بۆیە ئەو هاوەڵەی فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە فەرموویەتی (ونحن حدثاء عهد بكفر) وەکو ئەوەی ڕوونکردنەوەیەک بێت کە ئەوان هێشتا شوێنەواری سەردەمی نەفامی لە مێشکیان مابووە بۆیە ئەو داوایەیان کردووە، هەرچەند موسڵمانان بۆ جەنگ دەرچووبوون بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ نەبوو لەئاست ئەو داواکاریەو هاتەدەنگ، خۆ ئەگەر سەرکردەیەکیتر بووایە ڕەنگە بێدەنگ بوایە لەترسی ئەوەی نەوەکو کێشە دروست بێ و بەشێک بگەڕێنەوەو شەڕ نەکەن، بەڵام پێچەوانەی ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺدەنگی هەڵبڕی، سەیری نیازیانی نەکردو نەیگوت نیازیان پاکە، بەڵکو سەیری هەڵەکەی کردو وەڵامیانی دایەوە، لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتی کوفری گەورەی داگرتە سەر کوفری بچووک، وە پێغەمبەری خوا ﷺ کافری نەکردن چونکە بەنەزانین ئەو داوایەیان لێی کردو نەزانین هۆکارێکە لەهۆکارەکانی شرک، بۆیە جاری وا هەیە ئەو نەزانینە کوفری گەورەیە جاری وایە کوفری بچووکە، بەڵام ناکرێت بەو



اطلاقة بڵێیت هەموویان کافرن بۆی هەیە کەسەکە کافر بێت یا کافر نەبێت. وە زۆرجار خەڵک بەنەزانی و جەهلەوە زۆر شت دەکات و نازانیێ کە کوفرە وەک ئەو هاوەڵەی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺو سوجدەی برد بۆ پێغەمبەری ئازیز ﷺو پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێکرد چونکە سوجدە تەنها دەبێت بۆ خوا ببردرێت وە هیچکات ئەو هاوەڵە بەڕێزە ئەو کارەی نەکردەوە.

دووەم/ شرکی بچووک: ئەگەر مرۆڤ بیروباوەڕی وابێت خودی ئەم شتانەی تەبەرووکی پێدەکات هۆکارن بۆ بەرەکەت ئەوە شرکی بچووکە.



## هۆکارەکانی شرک و تەبرووک:

یەکەم: نەزانی بەئایینی خوای پەروەردگار.

دووەم: زیادەڕەوی لەخۆشویستن و بەگەورەدانانی پیاوچاکان: ئەمە سەرچاوەی هەموو شەڕێکە لەسەرووی هەموشیانەوە شرک.

سێیەم: تەبەرووک کردن بەشوێنەواری پیاوچاکان و پێغەمبەران.

لەبابەتی شرک و تەبەرووکدا ئێمەی موسوڵمان نابێ بێدەنگ بین بەرامبەر ئەنجامدانی یان گوتنی کوفر، بەڵکو دەبێ بەوپەڕی جوانی و داناییەوە بەبەڵگەی قورئان و سوننەت وەڵامی ئەو قسەیە یان ئەنجامدانی ئەو کوفرە بدەینەوەو بەرامبەرەکەمان بەجوانترین شێوە تێبگەیەنین تا پەشیمان ببێتەوەو بەخۆیدابچێتەوەو دەستهەڵگرێ و ئیتر هەڵەی لەم شێوەیە ئەنجام نەداتەوەو لەبەندایەتیکردنی بەندەو دارو بەرد دوور بکەوێتەوە بۆ بەندایەتیکردنی خودا هەنگاو بنێ وەک چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ



و هاوەڵەکان دەیانفەرموو بە کافرەکان: (الله ابتعثنا لنخرج من شاء من عبادة العباد إلى عبادة الله)

الله ئێمەی ناردووە بۆ ئەوەی خەڵکی دەربکەین لەبەندایەتی بەندەوە بۆ بەندایەتی خوای بەندەکان.



## ٤- قوربانیکردن بۆ جگەلە الله ﷻ :-

ڕۆمانیه بتپەرستەکان لەکاتی بەڕێوەچوونی ئەم یادە سەگ و بزنیان بۆ خوداکانیان سەردەبڕی تا بیانپارێزێ و دووربن لەناخۆشی و ژیانێکی ئاسودە بەسەربەرن، بابزانین ئایینی پیرۆزی ئیسلام چۆن دەڕوانێتە ئەم باسە...

قوربانیکردن( الذبح): قوربانی پەرستنەو دەبێت تەنها بۆ الله ﷻ ئەنجامبدرێت وە دەبێتە هاوبەش (شیرک) ئەگەر قوربانیبکرێت بەمەبەستی نزیکبوونەوەو بەگەورەدانانی جگەلە خودای گەورە، الله ﷻ دەفەرمووێ:- {قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (١٦٢) لَا شَرِيكَ لَهُۥ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ}[١]. واتە({قل إن صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي} بڵێ: بەڕاستی نوێژو حەج و قوربانیی و ژیان و مردنم {لله رب العالمين} گشت

---

[١] - سورة الأنعام ١٦٢-١٦٣





هەر بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە، {لا شريك له} کە هیچ هاوەڵێکی بۆ نییە {وبذلك أمرت} هەر بەوەش فەرمانم پێدراوە، دەبێ هەر بۆ خودا بژییم و بمرم {وأنا أول المسلمين} دیارە کە یەکەم کەسیشم لەڕیزی موسڵمانانی ئەم ئوممەتەدا.)

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ:- (وَلَعَنَ اللَّهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللَّهِ ... )[1]
واتە: خودای گەورە نەفرەتی لەو کەسە کردووە کە قوربانی دەکات بۆ جگەلە خوا.)

## قوربانیکردن بۆ جگەلە خودا چەند شێوازێکی هەیە:-

١-قوربانی بۆ جنۆکە بکرێت بەمەبەستی نزیکبوونەوە لێی بۆ ئەوەی ناخۆشییەک لابدات.

٢-قوربانیکردن دوای تەواوبوون و دروستکردنی خانویەکی نوێ بەمەبەستی دوورخستنەوەی زەرەری جنۆکەکان.

---

[1] - مسلم



٣-قوربانیکردن لای گۆڕو مەرقەد بەمەبەستی سوودگەیاندن و دوورخستنەوەی ناخۆشییەک.

٤- هەموو قوربانییەک ناوی جگەلە خوای گەورەی لەسەرهێنرابێت لەکاتی سەربڕین، وەک کەسێک بڵێت بەناوی مەسیح، بەناوی مەلیک، بەناوی سەید فلان یا ناوی پێغەمبەرێک.

هەموو ئەو شێوازانە دەبێتە شیرکی گەورەو مرۆڤ لەئیسلام دەخاتە دەر.

یەکێک لەجوانترین کردارەکانی مرۆڤ قوربانیکردن و قوربانیدانە لەپێناو خودا...

لەوەش جوانتر ئەوەیە خودا ئەم کردارە جوانە وەربگرێت و لەخۆی نزیکت بخاتەوە...

## بابەتی دووەم: نەخوێندنەوەو هەوڵنەدان بۆ گەیشتن بەڕاستیەکان:-

زانست بنەمایەکی سەرەکیە لەژیانی مرۆڤدا. گەر زانست نەبوایە ژیانی مرۆڤایەتی پێشنەدەکەوت و زانیاریمان دەربارەی دەوربەر نەدەبوو.

زانست: پێدانی وێنەیەکە لەئەقڵ لەبارەی بۆچوونێکەوە کە دواتر لەگەڵ ڕاستیدا یەکدەگرێتەوە.

زانست: پێچەوانەی نەزانینەو ئامرازێکی سەرەکیە بۆ گەشەکردن و پێشکەوتنی ژیان لەسەر گۆی زەوی.

زانست زۆر بوار دەگرێتەوە وەک;

(زانستی ئایین، تەندروستی و پزیشکی، فەلەکی، سروشت، زیندەوەر، کۆمەڵایەتی، شوێنەوار، بیردۆزی، بایۆلۆجی توخم، زمان، مێژوو، ئابووری، ژینگە) و چەندین بواری دیکەش.



ئاشکرایە شارستانیەت کانیاوی زانست و داهێنانە، بەپێچەوانەشەوە داهێنان و زانست شارستانیەت دەخولقێنێت و پێشیدەخات.

قسەو باسی زۆر هەن لەسەر گرنگی زانست، ئێمە ئەوەی لێرە دەمانەوێت بەکورتی باسی بکەین زانین و زانستی ئاینیە.

لەئاینی پیرۆزی ئیسلامدا یەکەم وشە دابەزی بۆ پێغەمبەرەکەمان ﷺ اقراء بوو، بۆیە دەبێ ئێمە بزانین کاری لەپێشینەی ئەم ئوممەتە خوێندنەوەیە .

پەروەردگار دەفەرموێ :- (وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا )[1]. واتە:- ئەوە تۆ بڵێ: ئەی پەروەردگار زانیاریم زیاد بکە، (فەرمانی پێنەکرد بەداواکردنی زیادکردنی دونیا، بەڵکو زیادکردنی زانست و زانیاری، بۆیە تا وەفاتی فەرموو زانیاری لەزیادبووندا بوو، ئەمەیش بێنرخی دونیاو بەرزی پلەوپایەی زانست دەردەخات).

[1] طه (١١٤)



وە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ :- ([قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ])[1]. واتە:- (ئەی محمد ﷺ) بڵێ ئایا ئەوانەی دەزانن یەکسانن لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن بەڕاستی تەنها خاوەنانی ژیریی ئامۆژگاری وەردەگرن.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێ:- (من سلك طريقاً يطلب فيه علماً سلك الله طريقاً من طرق الجنة)[2]. واتە:- هەر کەسێک ڕێگایەک بگرێتەبەر بۆ بەدەستهێنانی زانست، خودا ڕێگایەکی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات.

هەروەها لەڕیوایەتێکیتردا پێغەمبەری نازدارمان ﷺ دەفەرموێ:- (طلب العلم فريضة على كل مسلم و مسلمة)[3]. واتە:- داواکردنی زانست پێویستە لەسەر هەموو باوەڕدارێکی پیاوو ئافرەت.

---

[1] الزمر ( ٩ )
[2] مسلم
[3] رواه ابن ماجة

زانایان پێناسەی زانستیان کردووەو فەرمویانە: زانست ناسینی شتەکانە وەکو خۆی.

لەپێش هەموو زانستەکان مرۆڤ دەبێ زانستی هەبێ بەتاک و تەنهایی الله ﷻ تا بەسانایی تووشی گومڕایی و هاوبەش دروستکردن نەبێت، الله تعالی دەفەرموێ: { فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ }[1]. واتە: دەی کەواتا چاک بزانەو دڵنیابە جگەلە خودا هیچ خودایەکیتر نییە.

لەو فەرموودە جوانەدا خودا تاکی خۆی ئاڕاستەی مرۆڤایەتی دەکات و باس و مەبەستی زانین بەگوێی مرۆڤایەتیدا دەدات، و مرۆڤیش پێویستە ئەو زانینە قبوڵ بکات و شوێنی بکەوێت و زانست بۆ خۆی کۆبکاتەوە دەربارەی هەموو شتەکانی دەوروبەر تا وێنەی ڕاستی لەمێشک و ئەقڵیدا دروست ببێت.

زانایانی ئیسلام زۆرن کە باسی فەزل و گەورەیی زانست دەکەن و زانستی شرعیشیان لەزانستەکانیتر زیاتر پێشخستوە، چونکە

---

[1] سورة محمد:١٩



بەبێ زانینی زانستی شەرعی ناتوانرێت پەرستشی باش و جوان و لەشوێن و کاتی گونجاو ئەنجام بدەن .

پێشەوا (محمد بن عبد الوهاب) فەرموویەتی: (الْعِلْمُ : هُوَ مَعْرِفَةُ اللهِ ، وَمَعْرِفَةُ نَبِيِّهِ ﷺوَمَعْرِفَةُ دِيْنِ الإِسلامِ بِالأَدِلَّةِ). واتە: زانست بریتییە لەناسینی خوا و ناسینی پێغەمبەرەکەی ﷺو شارەزابوونە لەئایینی ئیسلام بەبەڵگەوە.

وە پێشەوا (ابن القیم) فەرموویەتی: (الْعِلْمُ قال اللهُ قال رسولـهُ قال الصحابةُ). زانست بریتییە لەفەرموودەی خوا پاشان فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ و فەرموودەی هاوەڵەکان.

وە ئیمامی (ابن حجر العسقلانـی) فەرموویەتی: (الْمُرَادُ بِالْعِلْمِ: الْعِلْمُ الشَّرْعِـيُّ الَّذِي يُفِيدُ مَعْرِفَةَ مَا يَجِبُ عَلَى الْمُكَـلَّفِ مِنْ أَمْرِ عِبَادَاتِهِ وَمُعَامَلَاتِهِ ، وَالْعِلْمُ بِاَللَّهِ وَصِفَاتِهِ ، وَمَا يَجِبُ لَهُ مِنْ الْقِيَامِ بِأَمْرِهِ ، وَتَنْزِيهِهُ عَنْ النَّقَائِصِ، وَمَدَارُ ذَلِكَ عَلَى التَّفْسِيرِ وَالْحَدِيثِ وَالْفِقْهِ)[1] واتە: مەبەست لەزانست: زانستی شەرعییە کە سوودی شارەزابوونی تێدایە لەوەی کە پێویستە لەسەر هەموو

[1] - [فتح الباري شرح صحيح البخاري : (١ / ١٨٧)] .



موسڵمانێکی ئەرک لەسەر (تەکلیف لێکراو) لەبابەتی پەرستنەکانی و مامەڵەکانی، وە زانیاری دەربارەی خوای گەورەو سیفەتەکانی و ئەوەی کە پێویستە لەسەری لەپێناوی ئەودا پێی هەڵبستێ لەفەرمانەکانی و پاکڕاگرتنی لەکەموکوڕی، وە هەموو ئەوانەش ڕاوەستاون لەسەر تەفسیرو فەرموودەو فیقهـ.

پێشەوا شێخ (عبد الرحمن السعدي) فەرموویەتی: (الْعِلْمُ: معرفةُ الـحَقِّ بدليلهِ)[1]. واتە: زانست بریتییە لەناسینەوەی ڕاستی بەبەڵگەوە.

وە پێشەوا شێخ (ابن باز) فەرموویەتی: (الْعِلْمُ: قال الله قال رسوله، هذا هو العلم الشرعي، هو العلم بكتاب الله وسنة رسول الله ﷺ وما يُعين على ذلك)[2]. واتە: زانست بریتییە لەوەی لەوەی کە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویانە، ئەمە زانستی شەرعییە، کە بریتییە لەزانیاری بەکتێبەکەی خواو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وە ئەوەی یارمەتیدەرە بۆ بەدەستهێنانی ئەوانە.

---

[1] - [منهج السالكين وتوضيح الفقه في الدين]
[2] - [العلم وأخلاق أهله] .



لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەداخەوە زۆرن ئەو خوێندەوارانەی بەنەخوێندەواری و چاو بەستراوی ژیان دەکەن و هەست بەتامی زانست و زانین ناکەن بەتایبەتی لەکاتی ئەنجامدانی پەرستشەکانیاندا، جا بەشێکی زۆری موسڵمانان لەواتاو زانینی ئیسلام و ناسینی خوداو ئایینی ئیسلام و ناسینی پێغەمبەرەکەیان ﷺ شکستیان هێناوەو کارو کردەوەیەک ئەنجامدەدەن لەپێناو بەدەستهێنانی خێرو چاکە لەقیامەتدا، بەڵام بێئاگان لەوەی ئەنجامدانی ئەو جۆرە کارو پەرستشانە زیان دەگەیەنێت بەبیروباوەڕو هەموو شتێکیان.

بۆ نمونە: ڕۆژێ هاوڕێیەکم گوتی: من دەمەوێ مەولود بکەم بۆ پێغەمبەر ﷺ.

گوتم: پێش ئەوەی قسە لەسەر دروستی و نادروستی مەولود بکەم، دەپرسم ئایا تۆ پێغەمبەری خودات ﷺ خۆشدەوێ؟

گوتی: بێگومان سەد لەسەد.



گوتم: باشە دەتوانی چەند خولەکێک وەسفی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەیت؟...، بێدەنگ بوو، گوتم: کێشەنیە گەر بە دوو دێڕیش بێ وەسفێکی پێغەمبەری خودام ﷺبۆ بکە، هەر نەیزانی.

گوتم: بەچەند وشەیەک وەسفی پێغەمبەری خودام ﷺ بۆ بکە، نەیزانی و نەیتوانی.

دەپرسم ئایا دانایی ئەنجامدانی پەرستن لەکوێیە کە نەزانی خودا پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ کاریان چییەو داوای چیمان لێدەکەن، و فەرمانی چیمان پێ دەکەن؟

نەزانین هۆکاری سەرەکی ئەنجامدانی تاوان و ڕاست ئەنجامنەدانی پەرستشەکانە، وە هۆکارە بۆ هاوبەش بڕیاردان و هەنگاونان بەرەو گومڕایی و سەرلێشێواوی، زۆرن ئەوانەی بەنەزانی چەندین کار ئەنجامدەدەن بەناوی پەرستنەوەو کارەکەشیان کوفرە، بۆیە سەرەنجامی ئەنجامدانی هەموو کارێک بەنەزانین پەشیمانی زۆری لەدوایە.




الله تعالى دەفەرموێ : {وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ }[1]. واتە:- شوێنی شتێک مەکەوە زانستت لەسەری نییەو نازانی.

بە(نەزانی) هەنگاو مەنێ، بزانە (چی دەڵێی و باسی چی دەکەی و بەرەو کوێ دەڕۆیی).

قسەکردن و ئەنجامدانی پەرستش بەبێ زانست(عیلم) حەرامە، وە بۆ ئەوەی شتەکان وەکو خۆی بناسین و بەنەزانینەوە هەنگاو نەنێین پێویستە تا زووە هەنگاو بۆ فێربوونی زانست (عیلم) بهاوێژین.

بۆیە موسڵمان نابێ هەنگاو بهاوێژێ بۆ هیچ شتێک بەبێ زانست و نابێ بەرەو شتێک هەنگاو بنێ نەزانێ سەرەنجامی ئەو کارە دەیگەیەنێت بەچی.

زانست و کردەوە دوو شتن بەیەکەوە جوانن، هەر کەسێک شتێک فێربوو با بەکردەوە بیکات، وە زانست بانگی کردەوە دەکات ئەگەر وەڵامی دایەوە ئەوا دۆستایەتی دەکات، ئەگەرنا کۆچ دەکات و وازی لێدەهێنێت.

---

[1] - [الإسراء: ٣٦]

## بابەتی سێیەم: تێنەگەیشتن لەژیان و هیوا درێژی ، سۆزو شوێنکەوتن:-

بەکورتی تێنەگەیشتن لەژیان یەکسانە بەتێنەگەیشتن لەئایین، تێنەگەیشتن لەژیان و هیوا درێژی وا لەمرۆڤ دەکات بەرەو تاوان و دوورکەوتنەوە لەبەها جوان و ڕەوشتییەکان هەنگاوبنێ، تاوان و هەڵسوکەوتی ناشرین دەبێتە کاری بەردەوامی ژیان، چونکە مرۆڤ کاتێ تێنەگەیشت لەژیان و ئایینەکەی تاوانکردنی لەلا بچووک دەبێتەوە، لەلای گرنگ نییە لەبەیانییەوە تا ئێوارە تاوان بکات بەبیانووی ئەوەی تەنها ڕۆژێکەو دواتر ئەنجامی نادەمەوە، یان تەوبە دەکەم لەدوای ئەنجامدانی ئەو کارە خراپ و نابەجێیە، کە ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە گەورەو بچووکی ئەم میللەتەی گرتووەتەوەو ئامادەن بۆ تاوانکردن لەژێر ناوی یەک ڕۆژەو با ئەو ڕۆژە بەدڵی ئێمە بێت، لەکاتێکدا نازانین ئاخۆ ئەو ڕۆژە کۆتا ڕۆژی ژیانمان دەبێت یان دەستپێکی قۆناغی بەرەو تاوان چوون و گومڕابوونمان دەبێت، کە بەداخەوە دەبینین زۆربەیان بەرەو گومڕایی هەنگاویان ناوە. موسڵمان دەبێت زۆر لەوە خۆپارێزتر



بێت کە چرکەیەکیش بۆ تاوان هەنگاو بنێت و نابێت هێندە سادە بێت ژیانی دونیا هەڵیبخەڵەتێنێ و دوارِۆژی بیرببباتەوە، وە نابێت نە بۆ خۆی نە بۆ خەڵکیتر خۆی تووشی تاوان بکات، کەسانی زۆر هەن لەپێناو بەرامبەرەکەی خۆی تووشی ئەنجامدانی تاوان دەکات. مرۆڤ دەبێ حیسابی ئەو ڕۆژە بکات کە جگەلە کردەوەی باش و چاک و بۆ خودا ئەنجامدراو هیچ شتێکیتر لەقیامەت بەکەڵکی نایات و کەس هیچی بۆ کەس پێناکرێت. الله تعالی دەفەرموێ :- { يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْاْ يَوْمًا لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ}[1]. واتە: ئەی خەڵکینە! خۆتان لەسەرپێچی پەروەردگار بپارێزن و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن و لێی بترسن و لەو ڕۆژەش بترسن کە هیچ باوکێ هیچی لەدەس نایەت بۆ کوڕی خۆی و هیچ منداڵێکیش هیچی پێناکرێت بۆ باوکی خۆی. (واتە: تکاو لاڵەو پاڕانەوە لەو ڕۆژەدا بەکردەوەی چاک نەبێت هیچ کەڵکێکی نییە، بۆیە تەنانەت منداڵیش فریایی باوکی خۆی ناکەوێت) بێگومان

[1] [سورة لقمان ٣٣]



بەڵێنی خودا بەهاتنی ڕۆژی قیامەت ڕاستە  وریابن! ژیانی ئەم دونیایە فریوتان نەدات نەفس و شەیتانیش بەمۆڵەتدانی خودا چەواشەو سەرگەردانتان نەکات و فریوتان نەدات. وەک ئەم ئایەتەش دەفەرموێ: (يعدهم و يمنيهم وما يعدهم الشيطان إلا غرورا). سۆز (عاتيفه)، میللەتی ئێمە بەشێوەیەکی گشتی کەوتووەتە ژێر کاریگەریەکی گەورەی سۆز (عاتيفه)، سۆزش دەردێکیتری کوشندەیە لەناو هەرمیللەتێک هەبێت، چونکە میللەت بەچەند قسەیەکی سادە باوەڕدەکات و دەبێتە میللەتێکی خۆش باوەڕو شوێنکەوتەی هەموو کەس و شتێک بەبێ بیرکردنەوە، بێگومان ئەو شوێنکەوتنەش مەترسیدارە چونکە سۆز (عاتيفه) ڕێگرە لەبەکارهێنانی ئەقڵ ئەمەش واتا ئەقڵ هیچ کاریگەریەکی نییە بۆ بیرکردنەوەو هەڵسەنگاندنی شتەکان و بڕیاردان لەسەر هەر شت و باسێک کە دێتە پێش، کەواتە ئەقڵ ئەرکی خۆی لەدەستدەدات کە بیرکردنەوەو بڕیاردانە، سۆز دەبێتە پێشەنگ و بڕیار بەدەست، لێرەدا مەترسیەکە دەردەکەوێت چونکە هەرکەس چۆنی بوێت ئەوها یاری بەهەست و ژیان و گیانی ئەو میللەتە دەکات و میللەت دەبێتە داردەستی هەموو



کەسێ و شوێنکەوتەی هەموو جۆرە بەرنامەو پەیڕەوێک، جا ئەو بەرنامەو پرۆگرامانەش لەدژی خۆی و ئایینەکەی بێت یان نا لێپرسینەوە ناکات و شوێنی دەکەوێت وەک لەڕابردوو بینیمان و ئێستاش بەچاوی سەر دەبینین کە چۆن خەڵکی شوێن بەرنامەو فەرەی بۆگەن و دژەبەرنامەی ئیسلام کەوتوون و پشتیان لەئایین کردووەو سەرەڕای ئەوەش دژایەتی ئایینیش دەکەن لەکاتێکدا نوێژ دەکەن و ڕۆژوەدەگرن و چەند جۆرە پەرستشێکیتریش ئەنجامدەدەن، ئەمەش بۆ دونیایەکی کاتی و بەرژەوەندیەکی تایبەتی، جا پارەو پلەو پۆست بێت یان هەرشتێکیتر ژیانی دونیایان هەڵبژاردووە بەسەر ژیانی هەمیشەیی قیامەتدا. اللّٰه ﷻ دەفەرموێ: {يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ}[1]. واتە: ئەی هۆزەکەم بەڕاستی ژیانی ئەم دونیایە تەنها لەززەتەبردنێکی بەپەلەیەو بەڕاستی تەنها ماڵەکەیتر (بەهەشت) جێی مانەوەی هەمیشەییە.

[1] [سورة غافر ٣٩]

کەواتە زاڵبوونی هەست و سۆز (عاتیفە) زیانی زۆرەو موسڵمان دەبێت خۆی لێبپارێزێ و خۆی ڕابێنێت لەسەر بەکارهێنانی ئەقڵ و نەبێتە شوێنکەوتەی هیچ کەس و بەرنامەیەک جگەلە ئیسلام، چونکە ئەوانەی سۆز بەسەریاندا زاڵە لەڕێی ڕاگەیاندنەکان و هەندێ کەس زۆر بەئاسانی دەستەمۆدەکرێ و چەواشە دەکرێ، بەمەش تووشی گەورەترین دۆڕانی گیانی و دەروونی و دواکەوتوویی دەبێت، وە لەتێگەیشتن لەئایین و پێشکەوتنەکانی دونیا دایدەبڕێ و ڕۆژ بەڕۆژ گومڕاترو دواکەوتووترو هەژارتر دەبێت لەڕووی ماددی و مەعنەوی.

سۆز (عاتیفە) بەشێوەیەک لەشێوەکان جۆرێکە لە(کۆیلە)بوون

## ئایا گوڵ فرۆشتن لەم ڕۆژەدا حوکمی چییە؟

گوڵ فرۆشتن کارێکی دروستەو کێشەی تێدا نییە لەڕۆژەکانی ساڵدا،بەڵام نابێت تایبەت بکرێت بەهیچ ڕۆژێک بەتایبەت لەم ڕۆژی ڤالآنتاینەدا.

گەر کەسانێک هەڵسن بەفرۆشتنی گوڵ و دیاری، جا هەردیارییەک بێت تایبەت بەم ڕۆژە وەک ( گوول، ورچ، چوکلێت و شێوەی دڵ و ...تاد )تایبەتیان کرد بەم بۆنەو یادە کوفرییە، ئەوە فرۆشتن و کڕینی دروست نییەو پارەکەی حەرام دەبێت.

همموو ڕۆژە جیاوازەکانی ساڵ گوڵ و دیاری پێشکەش بەخۆشەویستانت بکە.

# چەند جۆرێکی خۆشەویستی لەئیسلامدا

لە ئیسلامدا جۆری خۆشەویستییەکان زۆرن کە هەریەکەیان گرنگی و تایبەتمەندی خۆی هەیە، ئێمە لێرەدا بەکورتی باسی حەوت جۆر خۆشەویستی دەکەین.

## ١- خۆشویستنی الله:-

بەرزترین جۆرو پلەی خۆشەویستی بۆ خودا بریتیە لەتاک پەرستن و هاوبەش بڕیارنەدان بۆی.

پەروەردگار دەفەرموێ: {وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْدَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ}[١]. واتە: هەندێ لەخەڵک هەیە هاوبەش بۆ خودا پەیدا دەکەن و بەقەد خودا خۆشیانیان دەوێن، بەڵام ئەوانەی خاوەن بڕوان خودایان لەهەموو کەس خۆشتر دەوێت.

[١] البقرة: ١٦٥



خۆشویستنی خودا سەرچاوەی یەکەمە بۆ کەسێک کە بیەوێت ئەم سۆزو خۆشەویستییە لەجێگای خۆیدا بەکاربهێنێت، وە خۆشویستنی خودا هەر قسەی سەر زمان نییە بەڵکو دەبێت بەکردار لەژیان ڕەنگ بداتەوە لەجێبەجێکردنی فەرمانەکانی و دوور کەوتنەوە لەو شتانەی قەدەغەی کردووە، وە مرۆڤ دەبێ خۆشەویستی خوای گەورەی لەبەرزترین ئاستدا بێت و لەهەموو شتێک و هەموو کەسێک خۆشتری بوێ.

بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی خودای گەورە دەبێت دووربکەویتەوە لەهەرشتێک کە خۆشەویستی خودا لاوازدەکات یان نایهێڵێت، جگەلە خۆشویستنی خودا هەرخۆشەویستییەکیتر مایەی نەهامەتی و سزای دونیا و بەرزەخ و قیامەتە بەتایبەت گەر لەچوارچێوەی شەرعی خودای گەورە نەبێت، بەڵام خۆشویستنی خودا هەمووکات مایەی حەوانەوەی دڵ و دەروون و پاراستنی دونیا و بەرزەخ و قیامەتە.

کەسانێ هەن خۆشەویستی خودا تێکەڵ بەخۆشەویستیتر دەکەن تا وەهای لێدێت خۆشەویستی خودا بەرەو نەمان دەبات، بۆیە

دەبێت بزانین خۆشەویستی خوداو جۆریتری خۆشەویستی کە دژی بەرنامەو فەرمانەکانی خودایەو حوکم بەیاساکانی خودا ناکات و پشت بەیاساکانی زەوی دەبەستن ئەو جۆرە خۆشەویستییە هەرگیز لەگەڵ خۆشەویستی خودا لەیەک دڵدا کۆنابنەوە وەک (ئیبن قیم) ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێت: (ناکرێت خۆشەویستی باڵا لەگەڵ خۆشەویستیتردا لەیەک دڵدا کۆبکەیتەوە، بەڵکو دەبێت دڵ خاڵی و پاک و ساف و یەکلا بێت بۆ خۆشەویستی باڵا، کە خۆشەویستی خودای گەورەیە ، واتە خۆشەویستی دوو دژ لەیەک کاتدا وە لەیەک دڵدا کۆنابێتەوەو مەحاڵە.

وە یەکێک لەگرینگترین سەلماندنەکانی خۆشویستنی خودا ئەوەیە گوێڕایەڵی بکەی و لەفەرمانەکانی دەرنەچیت، ئەوە خۆشەویستی نییە تۆ بەزمان بیڵێی و کاروکردەوەکانیشت پڕبن لەسەرپێچی و شکاندنی فەرمانی ئەو.

ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ:

تعصي الإله وأنت تظهر حبه　هذا محال في القياس بديع

لو كان حبك صادقاً لأطعته　إن المحب لمن يحب مطيع

في كل يومٍ يبتديك بنعمةٍ منه　وأنت لشكر ذاك مضيع

واتە: سەرپێچی خودا دەکەی و دەشڵێی خودام خۆشدەوێ، ئەوە شتێکی مەحاڵەو نابێ، ئەگەر خۆشەویستییەکەت ڕاست بێ، بەقسەی دەکەی، چونکە یەکێک یەکێکی خۆشبوێ بەقسەی دەکات، هەموو ڕۆژێک خوای گەورە چاکەو بەهرەت لەگەڵ دەکات، کەچی تۆ سوپاسی ئەو چاکانە ناکەی.

کەواتە پێویستە یەکایەتی الله ﷻ بپارێزیت لەخۆشەویستیدا، وە نابێت هاوەڵ و هاوبەشی بۆ بڕیار بدرێت لەخۆشەویستیدا، بەتایبەتی کە خوا گەورە بەهەموو شێوەیەک هاوبەش ڕەتدەکاتەوە لەپەرستن و تاکی خۆشەویستیدا، وە گوێڕایەڵی





بکرێت لەفەرمانەکان و نەهییەکانی، وە حوکم بگەڕێندرێتەوە بۆ لای ئەو، ئا ئەوەیە خۆشەویستی ڕاستەقینەو بەردەوام.

### ٢- خۆشویستنی پێغەمبەری خودا:-

لەدوای خوای گەورە دەبێت پێغەمبەرمان ﷺ لەهەموو کەس خۆشتربووێت، ئەو پێغەمبەرەی کە خودا هەڵیبژارد بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لەهەموو خراپەکاریی و زۆرداریەک، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: (ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الإيمان: أن يكون الله ورسوله أحب إليه مما سواهما، وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله، وأن يكره أن يعود في الكفر كما يكره أن يقذف في النار)[1]. واتە: سیٚ تایبەتمەندی هەن هەر کەسێک ئەم تایبەتمەنییانەی هەبێت، تامی بڕواداری بینیوەتەوە،

[1] {متفق عليه}.





یەکەم: خودا پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ لەهەموو کەس خۆشتربووێت.

دووەم: ئەگەر یەکێکی خۆشویست تەنها لەبەر خودا خۆشیبووێت.

سێیەم: زۆری پێناخۆشبێ بگەڕێتەوە سەر بێباوەڕی لەدوای ئەوەی کە خودا ڕزگاری کردووە، هەروەکو پێیناخۆشە فڕێ بدرێتە ناو ئاگر.

هەروەها دەفەرموێ: { لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من والده وولده والناس أجمعين }[1]. واتە: کەسێک لەئێوە بڕوای تەواو نییە، تا منی لەکوڕی و باوکی و هەموو خەڵکی خۆشترنەوێ.

---

[1] {متفق عليه}.



ئەگەر کەسێک بەڕاستی یەکێکیتری خۆشبوویت ئەوا لەهەموو شتێ ئەو پێش خۆی دەخات و ڕازیبوونی ئەو پێشدەخات، ئەگینا ڕاستگۆ نابێت لەخۆشویستنیدا، بەڵکو تەنها قسەیەو هیچیتر. ئەو کەسەی بەڕاستی پێغەمبەری خودای خۆشبوویت ﷺ ئەوا دەبێ نیشانەکانی ئەو خۆشەویستییەی تێدا دەربکەوێت.

وە خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ بەبانگەشەکردن نییە، تەنها بەدەم بڵێی من پێغەمبەرم ﷺ خۆشدەوێ، بەڵکو بەر لەهەموو شتێک دەبێت شوێنکەوتەی ئەو بێت، و سوننەتەکانی پیادەبکەیت، و گوێڕایەڵی گوفتار و کرداری بێت، وە دوورکەوێتەوە لەو شتانەی کە نەهی لێکردووە، وە هەموو کاتێک لەسەر خووڕەوشتی ئەو بێت لەخۆشی و ناخۆشیدا، لەتاڵی و شیرینیدا: وەبەڵگەش لەسەر ئەمە ئەو ئایەتەیە: {قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ}[1] . واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بەئیمانداران بڵێ: ئەگەر

[1] آل عمران ٣١



ئێوە خواتان خۆشدەوێت شوێنی من بکەون و لەفەرمانی من دەرمەچن، ئەوکاتە خودایش ئێوەی خۆشدەوێت و لەگوناه و هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت، ئەو خودایە لێخۆشبوو میهرەبانە.

وە نیشانەیتری خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە زۆر باسی بکەیت، چونکە کاتێک مرۆڤ یەکێکی خۆشبووێت زۆر باسی دەکات.

هەروەها نیشانەیەکیتری خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ باسکردنیدا زۆر ڕێزی لێبگری و خۆت ملکەچ نیشان بدەیت، وەخۆت بەکەم بزانی لەئاستی ووتەکانیداو لەکاتی ناوهێنانی.

هەروەها خۆشەویستنی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە هەرهەواڵێک لەپێغەمبەری خواوە ﷺ پێمان گەیشتووە بڕوای پێبکەین و دان بەئەوە بنێین کە ڕاستە، وەک الله ﷻ دەفەرموێ: { وَمَا يَنْطِقُ عَنْ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى }[1]، واتە: موحەممەد ﷺ

---

[1] النجم ٣-٤





بەهەواو ئارەزووی خۆی قسە ناکات، بەڵکو ئەوەی کە دەیڵێت وەحیەو لەلایەن پەروەردگاریەوە بۆی دێت.

هەروەها جێبەجێکردنی فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەش هەرکەسەو بەپێی توانای خۆی. وە خۆ بەدوورگرتن و وازهێنان لەهەرشتێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێکردووە. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمویەتی: (فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ، فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ ؛ فَدَعُوهُ )[1]، واتە: کە فەرمانم پێکردن بەشتێک بەپێی توانا جێبەجێی بکەن، هەرچیش ڕێگریم لێکردن و نەهیم لێکردن خۆتانی لێ بەدووربگرن.

وە هەروەها زیادو کەم نەکردن لەئایین، جا لەژێر هەربیانوویەک بێ چونکە ئەم ئایینە تەواو بووەو پێویستی بەزیادکردن و

---

[1] مسلم

کەمکردن نییە، خوای گەورە دەفەرموێ: { الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ }[1]. واتە: وا دینەکەم بۆتان تەواو کرد.

کەواتە هیچ مەجالی ئەوە نەماوە شتی زیادە بهێنرێت و بخرێتە ناو ئایینەوە، وە پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەندە ڕاستگۆو دڵسۆزبووە لەگەیاندنی ئایینەکەیدا تەنانەت باڵندەیەکیش بەئاسماندا نەڕۆیشتووە ئیللا خێرو شەڕی پێوتووین.

### ٣- خۆشویستنی جیهاد:

بەبڕوای من لەدوای خۆشویستنی الله ﷻ پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ خۆشویستنی جیهاد دێت، چونکە ئەم ئایینە بەبەخشینی ماڵ و گیان سەردەکەوێت.

[1] المائده ٣



جیهادیش جۆری زۆرە بۆ نمونە: جیهادی نەفس و جیهادی شەیتان و جیهادی بێبڕوایان و دووڕوو و موبتەدیع و ستەمکارو فاسقان، جیهادی بانگەوازی و چەندینیتر ...

موسڵمان دەبێت خۆشەویستی بۆ جیهاد لەناخیدا دروست بکات و لەوپەڕی خۆشویستنیدا بێت، تا بەهۆیەوە ڕەزامەندی الله ﷻ بەدەستبهێنێت، وە ئەو جیهادەی کە بەرپای دەکات بۆ چەسپاندنی حوکمی الله بێت، بۆ بەرزکردنەوەی وشەی تەوحیدو لاالەالاالله بێت، جا ئەو جیهادە لەڕێگەی بانگەوازەوە بێت یان لەڕێگەی جەنگەوە بێت.

جیهاد لەکورتترین پێناسە: بریتیە لەتەرخانکردنی هەموو ئەو توانایەی کە بەندە هەیەتی بەدڵ و زمان و ئەندامەکانی لاشەی وە ماڵ و گیان بەخشین لەپێناو الله تعالی بۆ سەرکەوتن بەسەر نەفس و شەیتان و دوژمنانی الله، بەئامانجی ئەوەی کە تەنها الله تعالی بپەرسترێت و وشەی لاالەالاالله بەزەوی الله ﷻ دا بڵاوبکرێتەوەو تەوحید بگەیەنرێتە هەموو کوچەو کۆڵان و




شەقامێکی ئەم جیهانەو بەرنامە دەستکردەکانیتر ڕەتبکرێنەوە بەسەر خاوەنەکانیاندا.

بەکورتی جیهاد بۆ ئەوەیە تا هەموو دەستەواژەو درووشمە کوفرییەکان لەسەر زەوی خودا ڕەتبکرێنەوەو نەمێنن، وە تەنها ئاڵای تەوحیدو لاالەالاالله لەسەر زەوی بشەکێتەوە.

بێگومان ئەم جۆرە خۆشەویتییەش دەبێت مرۆڤ لەناخی خۆیدا دروستی بکات و بەپێی توانا لەڕاستییدا جێبەجێی بکات.

٤- خۆشویستنی بڕواداران:-

بەها جوانەکانی ئیسلام هێندە زۆرن لەژماردن نایەن، یەکێ لەو بەهاو ئەرکە جوانانەی کە ئیسلام لەسەرشانی موسڵمانان دایناوە بریتیە لەخۆشویستن و دڵسۆزی بۆ یەکترو خەمخواردن و بەهاناوەچوون بۆ یەکتر، نزاکردن و ڕێی باش بەیەکتر نیشاندان و لەخەمی یەکبوون. خۆشەویستی مسوڵمانان و وەلاء دەربڕین بۆیان بەتەواو توکمەبوونی باوەڕەوە پەیوەستە، وە کۆمەڵێ حەقیشیان لەسەریەکە وەک لەفەرموودەیەکدا پێغەمبەری خوا ﷺ

چەند مافێکمان پێدەڵێت و دەفەرموێت: (حق الْمُسْلِمِ سِتٌّ: إِذا لقِيتَهُ فسلِّم عليْهِ، وإِذَا دَعاكَ فَأَجِبْهُ، وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصحْ لهُ، وإِذا عطَس فحمِد اللَّهَ فَشَمِّتْهُ. وَإِذَا مرِضَ فَعُدْهُ، وَإِذَا ماتَ فاتْبعهُ)[1]. واتە: حەقی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان شەش شتن: ئەگەر پێیگەیشتی سەلامی لێبکە، ئەگەر بانگی کردیت وەڵامی بدەوەو بەدەمیەوە بڕۆ، ئەگەر داوای ئامۆژگاری لێکردیت ئامۆژگاری بکە، ئەگەر پژمی و سوپاسی خوای کرد ڕەحمەتی بۆ بنێرە، ئەگەر نەخۆشکەوت سەردانی بکە، ئەگەریش مرد شوێن تەرمەکەی بکەوە.

وە پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەربارەی یەکێک لەو حەوت جۆر کەسانەی کە لەژێر سێبەری خودا کۆدەکرێنەوە لەقیامەتدا دەفەرموێ: {وَرَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ}[2].

واتە :- پیاوانێک لەپێناو خودا یەکتریان خۆشدەوێ، ئا ئاوانە

---

[1]- (رواه مسلم)

[2]- {متفق عليه}.

لەژێر سێبەری خودا حەشر دەکرێن کە لەو ڕۆژەدا جگەلە سێبەری ئەو هیچ سێبەرێکیتر نییە .

ئەم جۆرە خۆشەویستییە بەوە دەبێت کە یەکێکت خۆشویست لەپێناو خودا خۆشتبووێ، وە بڕواداارانیش پێویستە یەکتریان خۆشبووێ بێهیچ مەبەست و بەرژەوەندییەک و هەرشتێک لەدنیاو قیامەتدا بۆ خۆی پێیخۆش بێت دەبێت بۆ براکەشی پێی خۆش بێت لەبەر ئەوەی هەرەشەی کەموکوڕی ئیمانیان لەسەرە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه}[1]. واتە: هیچ کەستان ئیمانی تەواو نابێت تا ئەوەی بۆ خۆی پێیخۆشە بۆ براکەشی پێیخۆش بێت. کەواتە موسڵمان دەبێت بەوپەڕی دڵسۆزی و بێبوونی هیچ جۆرە بەرژەوەندییەک خۆشەویستی بەردەوام لەنێوانیاندا هەبێت.

ئا ئەوەیە جوانترین نیشاندانی نموونەی خۆشەویستی لەئیسلامدا.

---

[1] - {متفق عليه}.

## ٥-خۆشویستنی دایک و باوک وە خۆشویستنی منداڵ لەلایەن دایک و باوک:-

لەزۆر شوێن باسی گرنگی و ڕێزی زۆری دایک و باوک کراوە کە مرۆڤی موسڵمان لەسەری ئەرک کراوە ڕێز لەدایک و باوکی بگرێت جا لەهەرقۆناغێکی تەمەنی ژیانیان بن نابێت بێزاری دەرببڕێ و قسەی ناشرینیان بەرامبەر بکات جگەلە قسەی جوان و شیرین نەبێت، وەک الله تعالی دەفەرموێ: { وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا }[١].

وَقَضَىٰ رَبُّكَ: "وامر ربك" واتە خودا فەرمان دەکات .

واتە: پەروەردگاری تۆ بڕیاریداوە کە جگەلە ئەو کەسیتر نەپەرستن، هەروەها بڕیاریداوە چاکەکاریش بن لەگەڵ دایک و باوکتاندا، هەرکاتێک یەکێکیان یان هەردووکیان بەپیری کەوتنە لای تۆ (تەنانەت) ئۆفیان لەدەست مەکەو (هەرگیز) پیایاندا

[١] - سورة الإسراء:٢٣





هەڵمەشاخێ و هاواریان بەسەردا مەکە، بەردەوامیش قسەو گفتوگۆت لەگەڵیاندا با چاک و جوان و بەجێ بێت. وە دایک و باوک دەبێت منداڵەکانیان خۆشبووێت و ڕێزیان بگرن وبەجوانترین شێواز بەپێی شەریعەتی ئیسلام پەروەردەیان بکەن، ئینجا دادپەروەری بکەن لەنێوانیانداو جیاوازی نەکەن، هەرکاتێک دادپەروەر نەبن و جیاوازی بکەن لەنێوان منداڵەکانیان ئەوە ئەو خێزانە دووبەرەکی و ئاژاوە لەناویان بڵاودەبێتەوەو بەرەو ئاقارێکی ترسناکدا دەڕۆن و سەرەنجامی ژیانی منداڵەکانیش دەکەوێتە مەترسی و پەروەردەی خراپ وەردەگرن، لەکۆتاییشدا بەرەنگاری دایک و باوکیان دەبنەوەو ڕێزیان ناگرن.

بۆیە لەئیسلامدا باس لەگرنگی خۆشویستن و گرنگیپێدانی منداڵ دەکات لەلایەن دایک و باوکەوە تا منداڵ دانەبڕێ لەسۆزو خۆشەویستی بەردەوام و دواتر ئەوانیش خۆشەویستی بەرپابکەن لەنێوان خۆیان و دەورووبەردا.




## ٦- خۆشویستنی هاوسەر:-

لەیەکەم یەکتربینین ئەم خۆشەویستییە دروستدەبێت، دوای ئەوە مارەکردن و هاوسەرگیری. خۆشەویستی نێوان ژن و پیاو بەوە دەبێت کە بەردەوام ئاگایان لەیەکتر بێت و ڕوو لەیەکتر وەرنەگێڕن و ببنە پشت و پەنای یەکتر، وە لەسەر کۆسپ و ناخۆشییەکانی ژیان و نەبوونی ماددی و نەخۆشی و ناخۆشی یەکتر بگرن، وە بۆ ئەوەی بەئاسوودەیی و کامەرانی و بەختەوەری بژین دەبێ یەکتریان خۆشبووێت و ڕێزی یەکتر بگرن و بەبەزەیی بن لەبەرامبەر یەکتردا. با لەپێغەمبەری خوداوە ﷺ خۆشەویستی فێربین ئەوەتا پێغەمبەری خودا ﷺ خاتوو خەدیجەی خێزانی زۆر خۆشویستووە، خۆشەویستییەکی وەها کە لەدوای مردنیشی وازیلێنەهێناوە، بۆیە هەرکاتێک مەڕێک یان بزنێکی سەر بڕیبا دەیفەرموو: بانگی خزمەکانی خەدیجە بکەن، ئینجا خاتوو (عائیشە) کە فەرموودەکەی دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەرم ﷺ تووڕە کرد گوتم: خەدیجە؟ فەرمووی:-



{ إني قد رُزقتُ حبَّها }[1] . واتە: لەڕاستیدا من خۆشەویستی (خەدیجەم) پێدراوە.

بەڵێ ئەوە خۆشەویستییە لەیەکەم ڕۆژی هاوسەرگیری نێوانیان تا دوای مردنی خێزانیشی هەرخۆشەویستی بۆ دەربڕیووەو لەبیری نەکردووە تا خۆشی وەفاتی کردووە واتە تا بەمەرگی خۆی شادبوو هەر خاتوو خەدیجەی لەبیر نەکردووەو خۆشیویستووە، ئا ئەوەیە وەفاو خۆشەویستییەکی بەردەوام نەک خۆشەویستییەک لەیەک ڕۆژ یان چەند ڕۆژێکی کاتی کۆ بکرێتەوە.

## ٧- خۆشویستنی خاک و نیشتمان:-

مرۆڤی موسڵمان پێویستە خاک و نیشتمانی خۆی خۆشبووێت و بەرگری لێبکات، وە ئەم جۆرە خۆشەویستییە نابێ لەسنووری خۆی دەربچێت و لەبەر خۆشەویستی نیشتیمان ئایین و ژینی بفرۆشێت و بیپەرستێ، گەر سەیرێکی ژیانی پێغەمبەری خوا

[1] ( رواه مسلم ٤/١٨٨٨ )

ﷺ بکەین دەبینین خاکەکەی کە مەککەی پیرۆزە زۆر خۆشدەویست بەڵام لەبەر ئایین و ﷲ پەرستییەکەی نیشتیمانی جێهێشت تا ئایینەکەی خودا سەربکەوێ، کاتێ کە پێغەمبەر ﷺیان لەمەککە دەرکرد ئاوڕی لەمەککە دایەوەو فەرمووی: (ما أطيبك من بلد وأحبك إلي ولولا أن قومي أخرجوني منك ما سكنت غيرك)[1]. واتە: هیچ شارێک لەتۆ دڵگیرتر نییە، هیچ شارێک لای من لەتۆ خۆشەویستتر نییە، خۆ ئەگەر گەلەکەم بەدەریان نەکردبام، (ئەوە قەت) لەشوێنێتر ئۆقرەم نەدەگرت.

گەر سەرنج بدەین پێغەمبەری خودا ﷺ دەرکرا هیچ بەرهەڵستییەکی نەکردو داوای لەکەسیش نەکرد تا بەرگری لەمەککە بکات و بڵێ هەرچی لەسەر خاک بکوژرێ شەهیدە، وە ئەوانەشی کە لەمەککە شەهیدبوون یان ئەشکەنجەدران هیچیان لەسەر خاک و نیشتیمان نەبوو بەڵکو لەسەر وشەی تەوحیدو بەتەنها دانانی خودابوو، دواتر فەرمانی کرد کە هاوەڵان مەککە جێبهێڵن وە خۆشی مەککەی جێهێشت، بەڵام کاتێ

[1] (أخرجه الترمذي)



قورئان و حوکمی خودای گەورە دابەزییە سەری گەڕایەوە بۆ خاکەکەی و لەدەست ستەم و ستەمی هاوبەش پەیداکەران ڕزگاری کرد، ئەمڕۆش زۆر خام هەن خۆشەویستن بەڵام واتای ئەوە نییە گیانی خۆتی بۆ ببەخشی، چونکە خاک هەیە تەنها سەرپێچی و دژایەتی خوداو بەرنامەی خودای تێدا دەکرێ وە لێناگەڕێن بەئازادی موسڵمانان پەرستشی تێدا ئەنجامبدەن و بانگەوازی پاک ڕێگری و دژایەتی دەکرێ، ئەوا گەر لەسەر ئەمجۆرە خاکە گیانت ببەخشی شەهیدی سەر کاغەزی (واتە تەنها لەسەر کاغەزێ لەپێشی ناوەکەت دەنوسرێ شەهید فلانی کوڕی فلان)، بەڵام گەر خاکێک قورئان تێیدا حاکمبوو حوکمی خودا جێبەجێ دەکرا ئەوکات شایەنی بەخشینی گیان و ماڵ و منداڵ و هەموو شتێکە، وە گیان بەخشین بەو خاکەش شەهیدی ڕاستەقینەیەو فیردەوس دەبێتە دوامەنزڵگای و تێیدا دەحەسێتەوە.




## وتەی پێش کۆتایی:

دەڵێین گەر ڤاڵانتاین پەیوەندی بە عەشق و خۆشەویستییەوە هەبوایە، دەبوو ڤاڵانتاین خۆی پاڵەوانی خۆشەویستی و عشق بوایە و لە پێناو عەشقەکەی گیانی خۆی بەخشیبوایە، نەک قەشەیەک کە عاشق نابن و هاوسەرگیری ئەنجامنادەن لەگەڵ ڕەگەزی بەرانبەر.

گەر وایدانێین ڤاڵانتاین قەشەبووە و لەپێناو هاوسەرگیری لەسێدارە دراوە، عەشق و خۆشەویستی و بێڕەوشتی چ پەیوەندی بە باسی ڤاڵانتاینەوە هەیە کە لەم سەردەمەدا ئەنجامدەدرێت، دەبوو لەجێگەی ڕۆژی خۆشەویستی و عەشق، ئەم ڕۆژە ناوبنرێت بەناوی " ڕۆژی هاوسەرگیری"، چونکە وەک باسکرا لەپێناو ڕێکخستنی هاوسەرگیری لەسێدارە دراوە نەک عەشق و خۆشەویستی.



## کۆتایی ئەم نوسینەم و سەرەتای نوسینی داهاتووم:-

بەڕاستی باسی ڕۆژی ڤالآنتاین جگەلە چەوشەکارییەکی زۆرو بێسەروبەرییەکی زۆرو بەلاڕێدابردنی خەڵکێکی زۆر لەئایین و دوورخستنەوەیان لەتەوحید هچیتر نییە.

بەداخەوەش ئێمەی موسڵمان ڕۆژانە ١٧ جار بەرامبەر الله دەوەستین و دەڵێین: {اهدنا صراط المستقيم} .

واتە :- خودایە ڕێگای ڕاستمان نیشان بدە، کەچی هەر خۆشمان سەرپێچی دەکەین.

١٧ جار داوای پارێزکاری دەکەین و داوادەکەین دووربین لەگومڕایی و سەرلێشێواوی وەک گاورو جولەکەکان و دەڵێین: { غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ } . واتە: نەک ڕێی ئەوانەی کە خەشم و قینی تۆیان بەسەردا ڕژا وەک گەلی یەهوود، وە نەک ڕێی ئەوانەیش کە گومڕاو سەرلێشێواو بوون، وەک گەلی گاوران.

کەچی خۆمان شوێنی ئەوان دەکەوین و خۆپارێزی ناکەین!!!.




لەئەم ڤاڵانتاینەش بۆمان ڕوون بوویەوە کە پڕیەتی لەچەواشەو خورافیات و پڕیەتی لەکوفرو شرک خوا پەنامان بدا، کە ئەمڕۆ بەداخەوە وڵاتانی ڕۆژئاواو وڵاتانی ئیسلامیش خۆیان بەجەژنێکی بێناوەڕۆکەوە خەریککردووە، ئەم بەناو جەژنەش بووەتە هۆی تێکدانی بیروباوەڕ (العقیدە)ی موسڵمانان و بەلاڕێ بردنیان و خەریککردنیان بەبابەتی لاوەکی و بێسوودو زیانبەخش بۆ تێکدانی تەوحید و ڕەوشتیان و شیرازە و یەکگتروویی خێزان و درووستکردنی ڕق و قینە لەنێوانیان زۆرێک لەخێزانەکان بەهۆی ئەنجامدانی کاری هەڵە لەلایەن تاکەکان یان چەند تاکێکی خێزانەکەوە لە ئەم ڕۆژەدا.

بەڵێ ئەم دەردە کوشندەیە ئێستا پەڕیوەتەوە نێو گەنج و لاوانی مسوڵمانەوە، پارەی بۆ خەرج دەکرێ و ئیعلام و ڕیکلامی بۆ دەکرێ و پەردەی شەرم و شکۆ لەنێوان لاوان هەڵدەگیرێ، وە لەبنەڕەتدا بەدیاریکردنی ئەم ڕۆژە بۆ خۆشەویستی شتێکی زۆر بێکەڵکەو هیچ واتایەکی ئەوتۆ نابەخشێت، چونکە دەبێت خۆشەویستی هەموو ڕۆژێک لەنێو دڵی مرۆڤەکان بەتایبەت

موسڵمانان زیندوو بێت و هیچ کاتێک خۆشەویستی خۆیان بۆ یەکتری لەدەست نەدەن .

ئەی مرۆڤی موسڵمان تۆ خاوەن بیروباوەڕێکی پاکی، کە هەڵقوڵاوی قورئان و سوننەتی ڕاستی پێغەمبەرە ﷺ بۆ بیروباوەڕی خۆت دەگۆڕیتەوە بەبیروباوەڕی کەسانێک کە بیروباوەڕیان تێکچووەو شێوێندراوە؟، بۆ چاو لەپێغەمبەری خودا ﷺ ناکەی بۆ چاو لەکەسانتر دەکەی؟!

خودای بەسۆز دەفەرموێ: {لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا}[1]. واتە: لەڕاستیدا لەپێغەمبەری خودا ﷺ سەرمەشقی چاکەتان بۆ هەیە، بۆ ئەوانەی هیواو ئومێدیان بەخوداو بەڕۆژی دواییەو ئەوانەی زۆر یادی خودا دەکەن. بۆیە لەم ڕۆژەدا نابێت و حەرامە کە هیچ درووشمێک ڕووبدات چ لەبواری جلوبەرگ و خواردن و خواردنەوەکان و دیاری بەخشین بێت یان هەر چالاکییەکیتر

[1]{الأحزاب: ٢١}




بێت، وە لەسەر موسڵمانان پێویستە کە بەعیزەتەوە دەست بەئایینەکەیانەوە بگرن و دوای ئەوانە نەکەون.

چەند هۆکارێک بۆ دوورکەوتنەوە لەبەژداریکردن لەو ڕۆژەداو مەترسی بەژداریکردن لەو ڕۆژە، لەئەوانە:-

*بەهیچ جۆرێک درووست نییە لەئیسلامدا کە ڕۆژێکی تایبەت دروستبکرێت بەناوی جەژنی خۆشەویستی، وە ئێمەی موسڵمان خاوەنی جەژنی خۆمانین و پێوەی پەیوەستین.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ : [ وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ ][1].

واتە: ئەوانەن کە ئامادەی شایەتیدانی درۆ نابن، شایەتییەک نادەن مافی خەڵکی تێدا پێشێل بکرێ .

ڕەبیعەی کوڕی ئەنەس فەرمویەتی: مەبەست لەم ئایەتە جەژنی گاورو خاچ پەرەستەکانە، باشە لەم بەڵگە بەهێزتر چیتدەوێ ؟!.

* لەڕۆژئاوا بیرکردنەوەیان ئاوایە کە ئەم ڕۆژە بەپیرۆز دەزانن، بێگومان ئەمەش مەترسیدارە بۆ موسڵمانان چونکە پیرۆزکردنی ڤالانتاین پێچەوانەی تەوحیدە .

---

[1] سورة الفرقان : ٧٢





* لەبنەڕەت ئایینی ئێمە هەموو ڕۆژێکی بۆ کردووین بەخۆشەویستی و ڕێزگرتن وەک (خۆشەویستی خودا پاشان پێغەمبەر ﷺ و دایک و باوک و خوشک و براو موسڵمانان بەگشتی و هاوسەرو منداڵ و مامۆستاو نیشتیمان و چەندینیتر).

* ئەو خۆشەویستییەی لەم جەژنەدا بانگەشەی بۆ دەکەن دوورە لەپاکی، چونکە بانگەشەیە بۆ بەستنی پەیوەندی خۆشەویستی کە حەرامەو ئەنجامدانی کارێکی ناشەرعی و ناڕەوایەو هۆکاریشە بۆ داوێنپیسی و تووشبوون بەزینا.

* هەموو گەل و نەتەوەیەک خاوەن ئایینێکی تایبەتە بەخۆیان و هەموو ئاینێکیش خاوەن جەژنی تایبەتە بەخۆیەتی وەک پێغەمبەری خوا ﷺ بە (أبو بكر)ی فەرموو: ئەی ئەبو بەکر هەموو گەلێک جەژنی تایبەتی خۆی هەیە ئەمیش جەژنی ئێمەیە، (واتە: ڕەمەزان و قوربان) جەژنیش لەئیسلامدا پەرەستنێکە لەپەروەردگار نزیکمان دەکاتەوە، لەئیسلامیشدا تەنها دوو جەژن هەیە جەژنی (ڕەمەزان و قوربان) .




وە هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا)[1]. واتە: هەریەکێک لەئێوە شەریعەت و پەیڕەوێکی تایبەتمان پێی بەخشیووە. بۆیە گەر جەژنێک تایبەت بوو بەگاورو خاچپەرستان قەدەغەیە موسڵمان بەجەژنی خۆی بزانێت، وەک چۆن جەژنەکانی ئێمەش قەدەغەیە لەلای ئەوان.

* بەشداریکردنت ڕەنگە توشی کوفرت بکات، چونکە بەشداریکردن بەواتای ئەوە دێت خوای گەورە ئایینەکەی بەتەواوی دانەبەزاندووە، و پێغەمبەی خوداش ﷺ ناپاکی لە گەیاندنی ئایینەکە کردووە پەنا بەخوای گەورە، بۆیە تۆ لەبەردەم دوو وەڵامدای، یەکەم: دەزانی حەرامەو کەچی سەرپێچی پەروەردگارت دەکەیت، کە ئەمەش سزایەکی سەختی لەدوایە.

دووەم: واهەست دەکەیت کە ئایینی ئیسلام تەواو نییەو قەدەغەی ئەم جەژنانەی نەکردووە لەکاتێکیشدا خوای گەورە دەفەرموێ: (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا )[2]. واتە: ئەمڕۆ ئاینەکەتانم بۆ تەواو (کامڵ)

---

[1] (سورة المائدة : ٤٨ )

[2] ( سورة المائدة : ٣ )




کردووەو چاکەو بەهرەی خۆم بەتەواوی ڕشتووە بەسەرتانداو ڕازیبووم کە ئیسلام ئایینتان بێت.

هەروەها دەفەرموێ: (وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ)[1]. واتە: هەرکەسێک دوای ئایینێک بکەوێت جگەلە ئایینی ئیسلام، ئەوە لێی وەرناگیرێت و لەڕۆژی دواییدا لەزیانمەندان دەبێت. هەروەها (ڤاڵانتاین)یش لەئیسلامدا بوونی نییە. کەواتە لەقەدەغەکراوەکانە.

* زانای پایەبەرز (محمد بن صالح العثيمين) سەبارەت بەڕۆژی ڤاڵانتاین دەڵێت: جەژن گێڕان لەڕۆژی ڤاڵانتاین دروست نییە لەبەر دوو هۆ:

یەکەم: جەژنەکە بیدعەیەو هیچ بنەمایەکی لەشەریعەتی ئیسلامدا نییە.

دووەم: بانگەشە دەکات بۆ پەیوەستبوون و سەرقاڵبوونی دڵەکان بەم کردەوە پووچانەی کە پێچەوانەی پەیڕەوی هاوەڵانە، بۆیە درووست نییە هیچ لەدرووشمەکانی ئەو ڕۆژە زیندوو بکرێتەوە

---

[1] ( آل عمران : ٨٥ )



چ لەخواردن و خواردنەوەو جلوبەرگ و دیاری بەخشین و .... هتد .

* شێخی ئیسلام (ئیبن تەیمیە) ڕەحمەتی خودای لەسەر بێ فەرمویەتی:

{جەژنەکان لەو تایبەتمەندیانەن کە ئاینەکەیانی لەیەکتر پێجیادەکرێتەوە} ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش (ڤالّانتاین)ی قەدەغە کردووەو بەشداریکردن تێیدا بەهیچ شێوەیەک درووست نییە و قەدەغەیە.

* هیچ خێرێک لەبەشداریکردن لەو ڕۆژەدا نییە جگەلە بەدڕەوشتییەکی زۆرو بڵاوبوونەوەی داوێنپیسی و دەستدرێژی و فێڵکردن و ئابڕووبردنی کچان و ئافرەتانی موسڵمان.

بۆیە کچان و کوڕان و ئافرەت و پیاوانیش دەبێ زیاتر وریابن و زیاتر خۆیان شارەزا بکەن لەئایین و زیاتر خۆیان پەیوەست بکەن بەقورئان و دەست بەبیروباوەڕێکی پاکەوە بگرن کە سەرچاوەی لەقورئان و سوننەتەوە گرتبێ، تا دووربن لەهەرکارێک کە ببێتە هۆی تێکدانی بیروباوەڕیان و تێکدانی تەوحیدو الله پەرستییەکەیان. وە موسڵمانان پێویستە خۆیان لەخودا نزیک





بکەنەوە بەپەرستش و هەوڵبدەن خۆشەویستی خودا بەدەستبهێنن تا لەقیامەتدا ئەو خۆشەویستییە بەهانایانەوە بچێ و ببنە خاوەنی باخ و کۆشکەکانی بەهەشت، نەک شوێن ئەو شتە پووچانە بکەوێ کە لەخۆشەویستی خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ دووریان دەکەنەوەو لەقیامەتدا دەبنە هاوڕێ و هاودەمی شەیتان و شەیتان پەرستەکان و دەبنە دۆڕاوێکی بێدەسەڵات و فڕێدراوی دۆزەخ و کەسانی لەبیرکراو، خودا پەنامان بدا.

رضيت بالله رباً ، وبالإسلام ديناً ، وبمحمد صلى الله عليه وسلم نبياً

داواکارم لە پەروەردگار لەهەڵەو کەموکوڕیەکانم ببورێ،

الحمدالله رب العالمين.

**سالار عومەر**

**٢٣/١١/٢٠٢١ سەرکارێز / هەولێر**

## سەرچاوەکان :


- قورئانی پیرۆز.
- فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ.
- /https://www.expatica.com
- www.bbc.com/arabic//:
- https://www.mobtada.com
- https://www.cbc.ca/kidscbc٢/the-feed/the-story-of-cupid
- /https://www.smithsonianmag.com
- . Penus
- https://www.mobtada.com
- https://islamhouse.com/ku






## بەرهەمەکانی نووسەر:

١- ژیانی دووەمی مرۆڤ.

٢- پێگەی دایک و باوک لەم سەردەمە.

٣- ڤاڵانتاین لەنێوان ڕاستی و چەواشە.

٤- فیستیڤاڵی ڕەنگەکان ( holi).

٥- دەریایەکی بێ کەنار .

٦- هالۆوین جەژنی دەرەمۆک و ترسنۆکەکان.

٧-وشەکانم دەنگیان نایە.

٨-شاری زینا ( pompeii)

٩-یۆگا لەنێوان (وەرزش، فەلسەفە، ئاییندا).

١٠- (٢٠)بابەتی گرنگ و پوخت دەربارەی قوربانیکردن

١١- ئاهەنگی ڕۆژی دەرچوون لەکۆلێژ و پەیمانگەکان.

١٢- جوولەکە لەتەورات و ئینجیلدا.

١٣- شاخەوانی ( مێژوو،پێداویستی، سوودەکانی)

١٤- دوورگەی لیتل سانت جەیمس.

١٥-پایەکانی ئیسلام و ئیمان بۆمنداڵان و نەوجەوانان.



١٦- ئادابی ئیسلامی جوان بۆ منداڵان و نەوجەوان.

١٧- بیست پرسیار لەلایەن منداڵان وەڵامیان لەپێغەمبەری خودا.



# پێڕست





دوای خوێنـدنەوەی ئەم پەرتـووکە ئایـا بـڕوات بەبەنـاو جەژنـی ڤاڵانتاین هەیەو دەتەوێ بەژداربیت؟، گەر وەڵامەکەت (بەڵـێ) یە بۆچی؟ گەر وەڵامەکەت (نەخێر)ە بۆچی ؟

...............................................................

...............................................................

...............................................................

...............................................................

...............................................................

...............................................................

...............................................................

...............................................................

...............................................................

...............................................................

...............................................................

...............................................................

...............................................................

...............................................................

...............................................................

.................................................... .